# پەیامەکانی قورئان

## ادهم شرقاوي

{أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهُ}

«ئەوانەی کە خوای گەورە هیدایەتی داون ئەی محمد تۆش شوێنی هیدایەتی ئەوان بکەوە  شوێنی پێغەمبەرانی پێش خۆت بکەوە»

ئەی خودایە

من بەو شێوازەی شایەنی پەرستنی تۆیە نوێژ ناکەم

و وەکو پێغەمبەر داود بەڕۆژوو نابم بۆت

و لەکاتی نەخۆشیدا وەکو پێغەمبەر ئەیوب ئارام ناگرم

و وەکو پێغەمبەر نوح لەسکی حوتدا پەرستنش و خودا پەرستنی ناکەم

و وەکو پێغەمبەر یەحیا ئاینم بەقورسی نەگرتووە

و چاوپۆشی ناکەم وەک چۆن پێغەمبەر یوسف هەموو برینەکانی داپۆشی

و بە شێوەیەک بەخشندە نیم کە بڵێم :بڕۆن ئێوە ئازادن.

بەڵام من لە شتێکدا وەکو ئەوانم:تۆم

خۆشئەوێ خودایە.

{وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيكَ}

چەندەها پێغەمبەری تر هەن کە چیرۆکیمان بۆ تۆ نەگێڕاوەتەوە

نەزانینی خەڵکی تۆی پایەدارتر کردووە بێئومێد مەبە

ئەوەندە بەسە کە خودا ئەزانێ تۆ کێیت

پای تەرازوی نوح بەوە بەرز نابێتەوە کە ئێمە ئەو دەناسین

و پای تەرازووی پێغەمبەرەکانی تر کەم ناکات تەنها لەبەر ئەوەی خودا پێی نەوتووین و نایزانین.

لە سوپای هارون ڕەشید بیست هەزار شۆڕشگێڕ هەبوو،

کە ناویان لە لە دیوانی سوپا نەنوسیبوو بۆ ئەوەی هیچ پارەیەک وەرنەگرن و تەنها خودا بەشەهید بونیان بزانێت.

سائبی کوڕی ئەقرەع ناوی شەهیدەکانی موسڵمانانی بۆ عومەری کوڕی خەتاب هێنا ،

ئەویش چەند ناوێکی ناسیاو و گەورەی خوێندەوە ،

سائب وتی هەندێک کەسی نەناسراوی دیکەش کە فەرماندەی ئیمانداران نایانناسن .

عومەر گریا و وتی عومەر نایانناسێت بەڵام خۆ خودا ئەیانناسێت

{إِنَّ الْحَسسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيئاتِ}

بەڕاستی چاکەکان خراپەکان ئەسڕێتەوە و نایهێڵێت

هەرکات تاوانێکت ئەنجام دا لەناخەوە بەخۆت بڵێ :شەڕێکم دۆڕاند بەڵام جەنگەکەم نەدۆڕاندووە!

دامەڕوخێ بەڵکو خۆت بنیات بنێ بە دەستنوێژ و دوو ڕکات نوێژ

بەو پەنجانەی کە تاوانت ئەنجام دا داوای لێخۆشبون بکە.

بە هەمان چاو کە سەیری حەرامت کرد قورئان بخوێنە.

گریە و ناڵەی تەوبەکاران لەلای خوا وەکو موناجاتی موسڵمانە گوێڕایەڵەکان وایە.

ناوی خۆی ناوە (الغفور) چونکە ئەیەوێ بگەڕێیتەوە لای و لێت خۆش بێت

{بَلِ الإِنسانُ عَلَىٰ نَفْسهِ بَصِيرَةً}

مرۆڤ خۆی باشتر ڕاستی حاڵی خۆی ئەزانێ کە بڕوادارە یان کافرە

پیاهەڵدانی خەڵکی سودیان بۆت نابێ

ئەگەر ئەو باشیەی ئەوان ئەیڵێن تێتدا نەبێت

و قسەی ناخۆشی خەڵکی زەرەرت لێ نادەن

ئەگەر ئەو خراپەیەی ئەوا. ئەیڵێن لە تۆدا نەبێت.

و مرۆڤ هەرچەن چاکەکار بێت کەسێک هەر ئەبێ کە ڕقی لێی بێت،تەنانەت پێغەمبەرانیش هەموو کەس خۆشی نەویستوون.

و مرۆڤ هەرچەندە بگاتە لوتکەی خراپی کەسێک هەر هەیە خۆشی بوێت،تەنانەت فیرعەون و نەمرودیش کەسێک هەبوو خۆشی بوێن.

مەترەفی کوڕی عەبدوڵا ئەڵێ:ئیمامی مالک لێی پرسیم خەڵکی ڕایان چیە لەسەرم؟؟

منیش وتم:هاوڕێکانت وەک کۆڵەکە پشتت پێوە ئەدەن  و کەسی دوژمنیش دەڕوخێی بەسەریدا.

ئەویش فەرمووی هێشتا خەڵکی وان بەڵام خودا یارمەتی دەرمان بێت لە ڕۆژێک کە زمانی هەموو خەڵک هەمان شت بڵێن.

ترسا لەوەی هەموو خەڵک بە باشە باسی بکەن و لەخۆ بایی ببێت،یانیش بە خراپ باسی بکەن و شتێک لەو خراپەیەی تێدا بێت.

مردن کۆتایی

چیرۆکەکە نییە

بەڵکو

تەنها سەرەتایە

{وَ آتاكُم مَّن كُل ما سَأَلتُمُوهُ}

هەموو شتێک کە ئێوە داواتان کردووە خوای گەورە پێی بەخشیون

ئەو خودایە

کێ بەترساوی چووەتە لای و بە دڵنیاییەوە نەهاتبێتەوە؟

کێ هەبووە بەشکاوی چوبێتە لای و چاکی نەکردبێتەوە؟

کێ هەبووە داوای هاوکاری لێ کردبێت و سەری نەخستبێ ؟

کێ هەبووە بە دڵتەنگی چوبێتە لای و دڵخۆشی نەکردبێ؟

کێ هەبووە بە دودڵیەوە چوبێتە لای و ڕێگەی نیشان نەدابێت؟

کاتی گیرا بونی دوعاکان بخەرە لاوە،و داواکارییەکانت بکە

لە سێیەکی کۆتای شەودا داوا بکە

و تیری دوعای کاتی بەربانگ نیشانە ئەپێکێت ،

متمانەت بە پەروەردگارت هەبێ چونکە هەر دەستێکی بەتاڵ بۆ لای ئەو دریژکرا بە بەتاڵی نایگێڕێتەوە.

و پێش هەموو ئەمانش خۆراکەکانت با حەڵاڵ بن

{عَسَىٰ رَبُنا أَن يُبَدِلَنَا خَيراً مِّنْهَا}

بەڵکو خوای گەورە بۆمان بگۆڕێ بە باشتر

بەم ئایەتە ئاگری هەموو ئەو حەسرەتانە بکوژێنەوە لە دەستت چوون،و بۆ هەر کارێک کە لەدەستت داوە،

و بۆ هەموو خۆشەویستێک کە لە نیوەی ڕێگا دەستی بەردای،

و بۆ هەموو هاوڕێیەک کە پێت وابوو ڕوویەکی جوانی هەیە بەڵام ئەوە تانها ماسکی گورگێکی بریندار بوو.

ئەوەی خودا لێی بردی خێری تێدایە ،

و ئەوەشی بۆی جێهێشتی ڕەحمەتی تێدایە،

بۆیە ئەگەر خێرەکەت زانی سوپاسی بکە

ئەگەریش نەتزانی ئارام بگرە

قەدەرەکانی خودا هەمووی خێری تێدایە تەنانەت ئەگەر ئازاریشت بدات.

{وَقَاسَمَهُما إِنِّي لَكُما لَمِنَ النَّاصِحِينَ}

شەیتان سوێندی بۆ خواردن کە من دڵسۆز و ئامۆژگاری ئێوەم

ئادەم و حەوا سەلامی خوای لەسەر بێت نەیاندەزانی کە کەسێک ئەتوانێ بەدرۆ سوێند بە خودا بخوات.

بەڵام ئیبلیس سوێندی درۆی خوارد

ئامۆژگاری کرد،ناوی شتانێکی بە شێوەیەک هێنا کە وانەبوون بۆ هەڵخەڵەتاندن.

درەختەکە ناوی درەختی سەرپێچی بوو،ئەو ناوی لێ نا درەختی ژیانی هەتاهەتایی.

و ئیبلیسەکانی ئەمڕۆ لەسەر ڕێچەکەی ئیبلیس ئەڕۆن.

مەی گیراوەیەکی دەرونیە

ناپۆشتەیی مۆدێلە

هەوەسبازی شارستانیە

زیناکردن کراوەییە

با ناوەکان فریوت نەدەن هەرچەن گۆڕدران.

{وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغفِرَةٍ مَّن رَبَّكُمْ وَجَنةٍ عَرْضُها السَّماوات وَالأرضُ أُعِدَّت ْ لَلمُتَّقِينَ}

پێشبڕکێ و پەلە بکەن بۆ لێخۆشبونێک لە پەروەردگارتان بۆ بەهەشتێک کە پانتایەکەی فراوانە هێندەی فراوانی ئاسمانەکان و زەوی کە خودای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسانەی تەقوای خوا ئەکەن

پەلە بکەن،چونکە مردن چاوەڕێ ناکات

سبەی تۆببە ئەکەم..سبەی بەرنامەیک بۆ خوێندنەوە دائەنێم...سبەی دەست بە ڕێجیم ئەکەم...

سبەی دێت و هیچ کام لەوانەت نەکرد کە مەبەستمان بوو.

و لەسەر پشوو دێژی هیوا،هەموومان پێمان وایە مردن دورە.

هەر بەو بۆنەیەوە ئەمە بیرکردنەوەی ئەو کەسانەش بوو کە چرکەیەک پێش ئێستا مردن.

پەلە بکەن،چونکە درەنگ کەوتنی چەند چرکەیەک لەوانەیە تەمەنێکی پێ بچێت.

سونابحی ئەڵێت: لە یەمەن بەڕێکەوتین بەرەو مەدینە بۆ بینینی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)

کاتێک گەشتین پێیان وتین پێغەمبەر(صلی الله علی وسلم)پێنج شەو ئەبێت مردووە.

دواکەوتنی پێنج شەو شەرەفێکی گەورەی لەدەستدان.

پەلە بکەن لەوانەیە دواکەوتنی یەک کاتژمێر بەهەشتت لەدەست بدات.

{كُل نَفسٍ ذَائِقةُ المَوتِ وَنَبلُوكُم بِالشَرَّ وَ الخَيرِ فِتنةً وَإلينا تُرجعونَ}

هەموو نەفسێک ئەبێت مردن بچێژێت

و ئێوە تاقی ئەکەینەوە بە دڵتەنگی و دڵخۆشی بە نەخۆشی و بە ساغی بە هەژاری و دەوڵەمەندی تا دەربکەوێ کێ سوپاسگوزارە و هەر بۆ لای خوداش ئەگەڕێنەوە

مردن ئەو پەرداخەیە کە هەمووان لێی دەخۆنەوە

بڕوادار و بێ باوەڕ،پێغەمبەر و ستەمکار،جن و فریشتە

جگە لە خودا هیچ کەس نامێنێتەوە.

مردن کۆتای چیرۆکەکە نییە بە پێچەوانەوە تەنها سەرەتایەتی.

مردن با بەس بێت بۆتان وەک وتاربێژێک.

ئەبی نەواس کە بە مەی خواردن بەناوبانگ بوو دراوسێیەکی باشی هەبوو

زۆرکات دوعای ئەکرد و ئەپاڕایەوە واز لە مەی بهێنێت.

کاتێک ئەم دراوسێیە مرد،ئەبو نەواس لە پرسەکەی هاتوچۆی ئەکرد.

کاتێک لەسەر گۆڕەکەی وەستا وتی: تۆ ئێستا لە زیندووی زیاتر بانگم ئەکەی.

واتا هەموو ئەو قسانەی بە زیندووی پێو ئەوتم و سودی نەبوو هێندەی ئەوە کاریگەر نیە کە لە گۆڕدا ئەتبینم.

{وَ اسْتَعينوا بِالصَبرِ وَ الصَلاةِ وَ إِنَّهَا لكَبيرةٌ إِلا عَلى الخاشعينَ}

پشت ببەستن بە ئارامگرتن و نوێژکردن بەڕاستی نوێژ زۆر گەورە و قورسە تەنها لەسەر کەسانێک نەبێت کە خاشع و ملکەچی خودان

ئەم ژیانە بۆ تۆو چاندنە نەک بۆ دورینەوە

و شوێنی تاقیکردنەوەیە نەک وەرگرتنی پاداشت.

یەکێک لە تاقیکردنەوەکانی پەروەردگار ئەوەیە کە بەڵا ئەدات بەسەر بەندەکانیدا

لەدەستدانی ئازیزان بەڵایە

لەدەستدانی پارە و موڵک بەڵایە

و دراوسێی خراپ و هاوسەرگیری خراپ و سەرکردەی ستەمکار هەموو ئەمانە بەڵاو کارەساتن.

ئەوەی ئارامگر بێت سەرکەوتوو بوو لە تاقیکردنەوە

و ئەوەی و ئەوەی ئارام نەگرێ شکستی هێنا

هیچ مرۆڤێک بێ بەڵا لە دنیا دەرناچێ تەنانەت پێغەمبەران ،ئەوان سەختترین بەڵا و کارەساتیان هەبوو.

دەوترێ کاتێک زولقەرنەین گەشتە بابل زۆر بە سەختی نەخۆش کەوت

زانی ئەوە مردنە ،دایکی بەبیریدا هات ،ویستی ئارامیەک بەدڵی بدات بۆیە بەرانێکی گەورەی بۆ نارد.

و وەسیەتی کرد کە ئەگەر مرد سەری ببڕێت

و لێی بنێت و بانگی هەموو ئەو کەسانە بکات بۆ خواردنی کە هەرگیز بەڵا و کارەساتیان بەسەر نەهاتووە

کاتێک مرد دایکی وەسیەتەکەی ئەنجام دا

بەڵام سەری سوڕما کە کەس نەهات

چونکە هیچ ماڵێک نیە لەدەستدانێک یاخود بەڵایەکی تێدا نەبێت.

لە پەیامی کوڕەکەی تێگەشت و دەستی کرد بە دوعا کردن بۆی و ئەیوت :خودا لێتخۆش بێت بە زیندووی و بە مردووی نیشاندەر بووی

{يا زَكريا إِنَّا نُبشرُك}

ئەی زەکەریا ئێمە موژدەت پێ ئەدەین

ئێسکەکانی لاواز بوون

سەری هەمووی سپی بوو

هاوسەرەکەی نەزۆک بوو

بەڵام ئەیزانی ئەم هۆکارانە کاریگەری لەسەر خەڵکی هەیە،بەڵام کاریگەری لەسەر کاری خودا نیە.

دەستەکانی بەرزکردەوە و پاڕایەوە وتی:

{فَهَبْ لي مِن لُدُنكَ وَلياً}

ئەی پەروەردگار لەلای خۆتەوە منداڵێکم پێ ببەخشە

وەڵامەکەشی دەستکەوت پێی وترا:

{يَا زَكريا إِنَّا نُبَشِرُكَ بِغُلامٍ}

ئەی زەکەریا ئێمە موژدەی کوڕێکت پێ ئەدەین

هەرکەس دڵی پەیوەست کرد بە هۆکارەکانی دونیا،خوداش بۆ هۆکارەکانی جێئەهێڵێت.

هەرکەسیش دلی پەیوەست کرد بە خودا

خودا هۆکارەکانی بۆ ئەگونجێنێت.

{فَادخُلوا أَبواب جَهَنم خَالدين فِيها فَلَبِئسَ مَتوَى المُتكبرين }

له دەركاكانی دۆزەخەوە بچنە ژورەوە و بە نەمری ە هەمیشەیی تێیدا بمێننەوە

دۆزەخیش خراپترین شوێنی ئەو کەسانەیە کە لە دونیادا خۆیان بە گەورە زانی

وەک چۆن جەستە نەخۆش ئەکەوێت بەهەمان شێوە دڵەکانیش نەخۆش ئەکەون.

بەڵام چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی جەستە ئاسانترە لە چارەسەری نەخۆشیەکانی دڵ

یەکێک لە خراپترین نەخۆشیەکانی کە توشی دڵ ئەبێت خۆ بە گەورە زانینە:

کاتێک مرۆڤ پێی وایە لەکەسانی چوار دەوری باشترە.

بەهۆی پارەیەک کە هەیەتی یان بڕوانامەیەک یان کار و کەسابەتێک.

جۆرێکیش لە خۆ بە گەورە زانین کە هیچ تایبەتمەندیەکی جیاواز لە کەسەکە نیە کە ئەمە خراپترین جۆری خۆبەگەورە زانینە.

لە فەرمودەیەک هاتووە:ناچێتە بەهەشت هەرکەس زەڕەیەک خۆبەگەورەزانین لە دڵی هەبێت.

کەسە باشەکان کاتێک هەستیان بە بچوکترین هەستی گەورەی بکردبا چارەسەریان ئەکرد.

یەکێک لە هاوەڵەکان بە ناوی جلیل عبدالله کوری سەلام لە بازاڕدا ئەڕۆشت و کۆمەڵێک دار لەسەر شانی بوو

پێیان وت:ئەی خودا دەوڵەمەندی نەکردی؟

ئەویش فەرمووی :بەڵێ بەلام ویستم خۆبەگەورەزانینم بشکێنم.

{وَعَنتِ الوجُوه لِلحيَّ القيوم وَقَد خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلماً}

ڕووەکان هەمووی زەلیل و ملکەچن بۆ خوای گەورە کە هەمیشە زیندووە و ناخەوێت و هەڵسوڕێنەر و بەڕێوبەری بونەوەرە و ئەوەی زوڵم و ستەمی کردبێ یان شەریکی بۆ خودا پڕیار دابێت لەو ڕۆژەدا زەرەرمەندە

خودای گەورە لە دوای هاوەڵ بۆ دانان بۆی ڕقی لە ستەمە.

ڕقی لە ستەم و ستەمکارانە.

خودا وەڵامی پاڕانەوەی کافرێک دەداتەوە کە لە موسڵمانێکی ستەمکاری بکات.

لەبەر خۆشویستنی بۆ کافر نیە و لەبەر ڕقی لە موسڵمان نییە.

بەڵکو خودا دادپەروەری خۆشئەوێت و ڕقی لە ستەمە.

ئیبن تەیمیە ئەڵێت:خودا دەوڵەتێکی بێ دینی دادپەروەر سەر ئەخات بەسەر دەوڵەتێکی موسڵمانی ستەمکار.

پیاوێک نوسراوێکی بۆ عبداللەی کوڕی عومەر نارد وتی :بە هەموو زانستێک بۆم بنوسە.

ئەویش فەرمووی:زانست زۆر زۆرە ئەگەر هەمویت بۆ بنوسم بەڵام ئەگەر توانیت لە دیداری خودادا بە زمانێکی تەواو سەبارەت بە نیشانەکانی موسڵمانان قسە بکەی ،پشتت سوک بە لە خوێنیان ،سک بەتاڵ بوی لە پارەی ئەوان ،ئەوە بیکە

{ثُم أَدبَرَ وَاستكبَرَ}

پشتی هەڵکرد ل هەق و بە پشتدا گەڕایەوە و خۆی بە گەورە زانی کەوا ملکەچ بێت بۆ قورئانی پیرۆز

جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان کەسێک کە بێ فەرمانی خودا ئەکات لە لاوازی و شکانی خۆیدا،لەگەڵ کەسێک کە بێ فەرمانی خودا ئەکات بەهۆی لوتبەرزی و خۆبەگەورەزانین و شانازی پێوە ئەکات.

ئەکەسەی کە تاوان ئەکات کاتێک ئامۆژگاری ئەکەیت:پێت ئەڵێت دوعام بۆ بکە،شەهوەتم زاڵ بوو بەسەرمدا،و شەیتان ڕاڕای لە دڵم دروست کرد،و خۆمی لا خۆشەویست کردم.

جیاوازە لەگەڵ کەسێک کە کاتێک ئامۆژگاری ئەکەیت پێت ئەڵێت: جا ئەوە کەی کێشەیە ،یەکجار ئەژیت بە دڵ خۆت بژی.

کەسی یەکەم گەڕانەوەی بۆ خودا ئاسانە چونکە کێشەکە لە برینەکانی خۆیدایە،

بەڵام دووەم گەڕانەوەی بۆ خودا سەختە،چونکە کێشەکە لە دڵیەتی.

سوفیان ئەڵێت:هەرکەس تاوانەکانی بەهۆی هەوەسبازی خۆی بێت خێری تێدایە.

و هەرکەس تاوانەکانی لە لوتبەرزی خۆی بێت ئەو کەسە مەترسی لەسەرە.

ئادەم سەلامی خوای لەسەر بێ بەهۆی حەزێکەوە بێ فەرمانی خودای کرد خوداش لێی خۆش بوو

بەڵام ئیبلیس بەهۆی لوتبەرزی خۆی بێ فەرمانی خودای کرد خوداش بە نەفرەتی کرد.

{وَلا يَجْرِ مَنكُمْ شَنَانُ قَومٍ عَلَىٰ أَلا تَعدِلوا }

ڕق لێبونتان بۆ کەسانێک واتان لێ نەکات دادپەروەر نەبن

ڕق لێبوونی زۆر کارەساتە

خۆشویستنی زۆریش هەر کارەساتە.

پێغەمبەر یوسف بە هەردووکی تاقیکرایەوە

ڕقلێبونی زۆر خستیە بیرەوە

خۆشویستنی زۆریش خستیە بەندیخانەوە.

ئێمە هەندێک کات دەسەڵاتی دڵی خۆمان نییە،

بەڵام فەرمانمان پێ کراوە بە دادپەروەری ئەگەر لە خۆشەویستی بێت یان لە ڕق.

هەر لەبەر ئەوە کاتێک کەسێکت خۆشویست خراپەکانیشی بە چاکە مەبینە بەهۆی خۆشویستنت بۆی.

و کاتێک ڕقت لە کەسێک بوو چاکەکانیشی بە خراپە مەبینە بەهۆی ڕقت بۆی.

دادپەروەر بە و شتەکانی لەشوێنی ڕاستی خۆیان دانێ.

عبداللەی کوڕی محمد ئەڵێ:چوینە لای ئیمامی ئەحمەد لێی پرسین لە کوێوە هاتون

ئێمەش وتمان لە کۆڕی ئەبی کورەیب.

ئەویش وتی :لەسەری بنوسن چونکە زانایەکی چاکە

ئێمەش وتمان :بەڵام ئەو تۆی چەقبەست کردووە

ئەویش وتی:زانایەکی گەورە کە بە من تاقی کراوەتەوە.

{وُجُوه يَومئذٍ نَّاضرةٌ إلىٰ رَبَها نَاظِرَةٌ}

لەڕۆژی قیامەت کۆمەڵێک ڕوو گەشاوە و پرشنگدار و جوانن ئەدرەوشێنەوە لەبەر ئەوەی تەماشای خوای گەورە ئەکەن

جوانترین نیعمەتەکانی بەهەشت حۆریەکان نییە،و ئەگەر ئەمە شتێکی جوانیش بێت

و لە ڕوبارەکانیدا نییە

و ئەگریش سەرنجڕاکێش بێت.

بەڵام نیعمەتە گەورەکە لە تەماشا کردنی ڕووی پەروەردگارە.

کاتێک موسڵمانەکان ئەچنە بەهەشت خودا لێیان ئەپرسێ هیچی ترتان ئەوێ بۆتان زیاد بکەم؟

ئەوانیش ئەڵێن:لەمە زیاتر چی کە لە بەهەشتین،ڕووت سپی کردین،لە دۆزەخ پاراستمانت

خوداش پەردەکان لەئەدات و ڕووی دەرئەکەوێت ،ئەهلی بەهەشت هیچ شتێکیان پێ نەدراوە خۆشەویست تر بێت لایان لە بینینی پەروەرگار.

{وَ لا عَلَىٰ الذين إذا ما أتوْك لِتَحمِلهُم قُلت لا أجدُ مَا أحمِلُكم عَلَيه تَولّوا وَّأعيُنَهُم تفيضُ مِنَ الدَّمعِ حَزَناًألاَّ يجِدُوا مَا يُنفِقونَ}

ئەو كەسانەی سزایان لەسەر نییە کاتێک دێن بۆ لای تۆ ئەی محمد تۆ پێت وتن کە هیچ ئاژەڵێکت نییە پێیانی بدەی و غەزای پێ بکەن

ئەوانیش لە گەڕانەوەدا فرمێسک لە چاوانیان ئەباری

ئەبولیلی و عبداللهی کوڕی مغفل هاتنە لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ڕۆژی شەڕی تبوک داوای ئەسپیان کرد تا بچن بۆ جیهاد ،

کاتێک پێی وتن کە هیچ نیە تا پێیان ببەخشێت هەردوکیان بە گریانەوە گەڕانەوە،

گریان لەبەر ئەوەی چاکەیەکیان لەدەست چوو

ئەی ئەبێ چۆن بگرین ئەگەر توشی تاوانێک ببن؟

ئەمە موسڵمانی ڕاستەقینەیە

سەختە لەلای ئەگەر دەرکایەکی نێوان خۆی و خودای لێ دابخرێ

ئەگەر لە هەوڵێکدابوو بۆ چاکە کردن بە هەموو برینەکانیەوە

بەڵام لەبەر هۆکارێک خودا بە قسمەتی نەکات

ئەی ئەبێ چۆن بێت ئەگەر بەهۆی تاوانێکەوە لە خودا دوربکەوێتەوە؟؟

{وَ لیعفوا ولینصفحوا أَلا تُحِبونَ أن یَغفِرَ الله لَکُم وَالله غفورٌ رَّحیم}

با لێبوردە و لێخۆشبوو بن لەو شتەی ئەوان کردویانە ئێوە لێیان خۆش بن و بیانبورن ئایا ئێوە پێتان خۆش نییە خودا لێتان خۆش بێت؟

خوای گەورە لێخۆشبوو و بە بەزەییە

ئەو دروستکراوەی کە پەروەردگار زۆری خۆشئەوێت

ئەو دروستکراوەیە کە گەورەی ئەنوێنێ و لێبوردە و لێخۆشبووە بەرامبەر خەڵکی.

جارێک پێغەمبەر(صلي الله عليه وسلم) ویستی خێر بکات

عولبەی کوڕی زەید هەژار بوو هیچی نەبوو بیکات بەخێر

هەستا و وتی ئەی پێغەمبەری خوا(صلي الله عليه وسلم) من بەوە خێر ئەکەم کە لە هەموو ئەوانە خۆشئەبم کە ستەمیان لێ کردووم.

بۆ ڕۆژی دواتر پێغەمبەری خودا(صلي الله عليه وسلم )پرسیاری عولبەی کوڕی زەیدی کرد

ئەویش هەستایە سەر پێ و وتی لێرەم ئەی نێردراوی خوا

پێغەمبەر(صلي الله عليه وسلم) فەرمووی : خودا خێرەکەی لێ قبوڵ کردی.

{قال يا بُني إِني أرَىٰ في المنامِ أني أذبُحُكَ}

پێی وت ئەی ڕۆڵەکەم من لە خەونمدا ئەبینم کە سەرت ئەبڕم

یەکێک لەسەختترین تاقیکردنەوەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

زانایەکی گەورە کە تەمەنی ڕۆچووە بێ چەند ساڵ بەش بوو لە منداڵ.

کاتێک خودا کوڕێکی پێدا و دڵی هۆگری بوو

فەرمانی پێکرا سەری ببڕێت.

ئەویش نە دودڵ بوو نە خاوە خاوی کرد.

باش ئەیزانی خەونی پێغەمبەران فەرمانی خودایە

هەر بۆیە پەلەی کرد تا فەرمانی خودا جێبەجێ بکات،تەنانەت ئەگەر بەپێی ئارەزووی دڵیشی نەبێت.

هەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر ئیبراهیم پێی ئەوترێت بە تەنها خۆی ئوممەتێک بوو.

چونکە خودای گەورە باش ئەیزانی چی لە دڵی هەیە ،لەخۆی باشتر.

بەڵام پەروەردگار زۆر میهرەبانترە لەوەی بهێڵێت ئازیزەکەی کوڕەکەی خۆی سەرببڕێت،بەڵام کە دڵی ئیبراهیم هۆگری ئیسماعیل بوو فەرمانی کرد سەری ببڕێت.

هەندێک دڵ هەن پەروەردگار غیرەئەکات جگە لە خۆشویستنی ئەو خۆشەویستی کەسێکی تری تێدابێت

{وَقدِمنا إِلىٰ ما عَملوا من عَمَلٍ فَجَعَلناهُ هَباء مَنثورا}

کافران ئەگەر کردەوەی چاکیان هەبێت لە ڕۆژی قیامەت هەووی ئەهێنرێ و ئەکرێ بە تۆزێکی بڵاو چونکە بۆ خودایان نەکردووە

لە کتێبی دەریایەک لە فرمێسک لە نوسینی ئیبن جوزی کە باس لە سعیدی کوڕی جبیر ئەکات ئەڵێ:بەندە لە ڕۆژی لێپرسینەوە بانگ ئەکرێت و کتێبی کردارەکانی خۆی پێ ئەدرێت،کاتێک سەیری

ئەکات نە نوێژ و نە ڕۆژووی تێدا نییە و هیچ کام لە کردەوە باشەکانی خۆی تێدانیە.

ئەڵێت خودایە ئەمە کتێبی من نییە!

من هەندێک چاکەم هەبووە کە لێرە نەنوسراون

لە وەڵامدا پێی ئەوترێ:پەروەردگار نە هیچی لێ ون ئەبێ و نە هیچی بیر ئەچێت،کردارەکانت بەهۆی باسکردنی خەڵکەوە هەمووی بەبایا چوو.

ئاگاداربە خودا پەرستی بۆ کەسێکی تر مەکە جگە لەخۆت.

نەکەی چاکەکانت بۆ کەسێک بڕوات کە دڵیت شکاندووە،و کەسێک ماڵەکەیت خواردووە،و کەسێک ستەمت لێ کردووە،و کەسێک کە کارەکەیت لێی دزی بەهۆی واسیتە کردن.

{وَتُوبوا إِلىٰ الله جَميعاً أيها المؤمنون لَعَلكُم تُفلِحون}

هەر هەمووتان ئەی بڕواداران تەوبە بکەن و بۆ لای خودا بگەڕێنەوە بەڵکو سەرکەوتوو و سەرفراز بن

ئیبن قیم خودا لێی خۆش بێت ئەیوت:

باشترین ڕۆژەکانی بەندە ڕۆژی گەڕانەوەیەتی بۆ لای خودا.

ئەوتریَ:کاتێک کەسێک تۆبە ئەکات و ئەگەڕێتەوە فریشتەکان ئەڵێن فلان کەس نێوانی خۆی و خودای چاککرد.

مرۆڤ کاتێک کەسێکی ئازیزی هەیە و لێک زویر ئەبن هەموو هەوڵێک ئەدات تا هەمووشت چاک بکاتەوە لە نێوانیان ،پەروەردگاریش شایستە ترینە بۆ ئەو هەوڵدانە.

هەر بۆیە ئەگەر کارێکت کرد بووە هۆی بریندار کردنی خۆشەویستی خودا لە دڵت،بەجۆرێک هەوڵی ڕازی کردنی بدە وەک بڵێی ئازیزێکت بێ لە دونیا.

جارێک بە خێر کردن،جارێک بە داوای لێخۆشبوون و نوێژ و قورئان خوێندن.

چونکە باشترین مرۆڤ کە هەوڵت بۆی دا دڵی ڕازی ئەبێ لێت ئەی چی لەسەر پەروەردگاری میهرەبان؟؟

{قُرَّت عَينٍ لي وَلَكَ}

ببێت بە ڕۆشنای چاوی من و تۆ

ئەمە ئەو قسەیە بوو کە ئاسیای کچی مزاحم بە فیرعەونی هاوسەری وت لەسەر موسا.

فیرعەون پێی وت: با بۆتۆ بێت من پێویستم پێ نیە.

پێغەمبەر(صلي الله عليه وسلم ) لەسەر ئەم ڕوداوە ئەڵێت:ئەگەر فیرعەون موسای بە کوڕی خۆی دابنایە وەک چۆن ئاسیای هاوسەری کردی ئەوا خودا ئەویشی وەکو ئاسیا هیدایەت ئەدا،بەڵام خودا بێ بەشی کرد.

قەدەر بە نیەتی دڵەکان بەستراوە،گەشبین بن ئێوەش ئەیدۆزنەوە.

ئەو کەسەی کارێکی دەست ئەکەوێت و لە ناخی خۆیدا پێی وایە ئەم کارە شوومە ،دڵنیابە هەروا بەسەری ئەشکێتەوە.

و ئەوەی هاوسەرگیری ئەکات و لە دڵی خۆی پێی وایە مامەڵەیەکی شکست خواردووە دڵنیابە هەروا ئەبێت بۆی.

با قسە و نیەتتان باش بێت،لەوانەیە بەهۆی زمانتان خێر و شەڕتان بۆ بێت.

{قُل الحمد الله بَل أَكثَرُهُم لَا يَعقِلونْ}

ئەی محمد تۆ سوپازگوزار و سەنا و ستایشی خودا بکە بەڵام زۆربەیان تێناگەن

ئەگەر لە وەسفکردنی خودا ورد بیتەوە بۆ زۆرینەی خەڵکی ئەبینی ئەڵێت:نازانن،سوپاسگوزار نین،ئەقڵیان پیا ناشکێت.

لەبەرامبەر ئەوش خودا ئەڵێت:{وَقَلیلٌ مِن عِبادي الشکور}

کەمێک لە بەندەکانم سوپاسگوزارن.

هەر بۆیە بەدوای زۆرینەی خەڵکدا مەچۆ

ئیمامی ئەحمەد لە حاتمی پرسی:چی ڕێگەیەک هەیە تا بگەیتە ئاشتی لای خەڵکی؟؟

ئەویش وتی:پارەی خۆتیان پێ بدەیت و پارەی ئەوان نەبەیت،ئازارت بدەن و ئازاریان نەدەی،بۆ بەرژەوەندی ئەوان هەوڵ بدیت بەرژەوەندی خۆت لا گرنگ نەبێ.

{وَلا تُطعْ كُل حَلَّافٍ مَّهين ،هَمازٍ مَّشاءٍ بِنَميم}

گوێڕایەڵی هیچ کەسێک نەکەی کە زۆر سوێند بە درۆ بخوات درۆزن بێت کەسێکی بێ ڕێز و بێ نرخ و لاواز و دڵ لاواز

قسەهێنان و بردن، ئەبێتە هۆی دابڕنی کۆمەڵ،ئەبێتە هۆی ڕوخانی پەیوەندیەکان،جا ئەوانەی قسە ئەهێنن و قسە ئەبەن چەندە زۆرنن.

کاتێک بە باشە باسی کەسیک ئەکەیت بەدەگمەن کەسێک هەیە ئەم باشەیە بگەیەنێتەوە پێی.

بەڵام کاتێک کەسێک بە خراپە باسی کەسێکی تر ئەکات خەڵکی پێشبڕکێ ئەکەن لەسەر ئەوەی کێ زوتر پێی بگەیەنێت.

کەسە باشەکانی ڕابردوو وا ڕاهاتبوون کە دەرکا دابخەن بەڕوی ئەو جۆرە کەسانە.

کەسێک ئەڵێت لەلای وەهەبی کوڕی منەبەهـ بووم پیاوێک هاتە لای و پێی وت :

لەلای فڵان کەسەوە هاتم و بە خراپە باسی ئەکردی

ئەویش پێی فەرموو ئایا شەیتان هیچ نێردراوێکی تری نەدۆزیەوە جگە لە تۆ؟؟

مەبن بە نێردراوی شەیتان.

{وَاذ قُلنا للملائكة اسجدوا لآدم فَسَجَدوا إِلاَ إبليس أبىٰ واستكبر وَكانَ مِن الكافرين}

خودا فەرمانی بە ئیبلیس کرد سوجدە ببات بەڵام لە فەرمانی دەرچوو ،هەر لەبەر ئەوەش خودا لە ڕەحمەتی خۆی بێ بەری کرد.

بەڵام ئەگەر لە ئیبلیس و لە کەسێکی نوێژنەکەر وردبینەوە سەرنجمان ڕائەکێشێت

ئیبلیس ڕەتی کردەوە سوجدە بۆ ئادەم ببات،

و نوێژنەکەر ڕەتی ئەکاتەوە سوجدە بۆ خودای ئادەم ببات.

تەماشای میهرەبانی و خۆشەویستی بۆ ئەم ئوممەتە،

خودا هەمووکات بەیانیان و ئێواران بانگی بەندەکانی ئەکات تا بگەڕێنەوە لای

تاوانیان هەرچەن گەورە بێ،و هەرچەن دوربوبن لە خودا.

{وَلا تُصعرْ خَدَّكَ لِلناسِ}

لەکاتی قسەکردن ڕوو لە خەڵک وەرمەگێڕە

یەحیای کوڕی موعین ئەڵێت:

هیچ کەسێکم نەبینیوە وەکو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

پەنجا ساڵ هاوڕێیەتیمان کرد ،

هەرگیز جارێک شانازی بە خۆی و چاکە و باشیەکانی نەکرد.

خودا لێی خۆش بێت هەمووکات ئەیوت:ئێمە کەسانێکی لێقەوماوین.

خۆبەکەمزانین:

ئەو پارەیەی لوتبەرزت ئەکات،هەژارییە

ئەو زانستەی خۆتی پێ گەورە ئەزانی،نەزانینە

ئەو پلەوپایەی وا ئەکا دەسەڵاتدار بی،بێدەسەڵاتیە

ئەو هێزەش کە وات لێ ئەکا ستەم بکەی،لاوازیە

دەوڵەمەندی و گەورەی و زانست لەلای خۆ بەکەم زانان ئەدۆزیتەو.

{وَاصبِرِ عَلَىٰ ما اصابك إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الأُمورِ}

ئارامبگرە لەسەر ئەو بەڵا و ناخۆشیانەی کە ڕووبەڕوت دێن دڵنیابە ئەمە لە کارە گرنگ و چاکەکانە

ئێمەی مرۆڤ لەم دونیایە بەپێی قەدەری خودای میهرەبان ڕێ ئەکەین.

ئەو نەخۆشیەی توشت نەبوو نەتئەتوانی خۆتی لێ لابدەیت.

ئەو مردنەشی بەسەر ئازیزێکتدا کەوت هەر ئەبوو ڕوبدات هەرچەن هەوڵت بدایە.

و ئەو کارەی لەدەستت دا هەر ئەبوو لەدەستی بدەیت تەنانەت ئەگەر هەموو بەیانیانێکیش پێلاوی بەڕێوبەرەکەت پاک بکردایەتەوە.

تەماشای پێغەمبەری خوا (صلي الله عليه وسلم)

ئەوەی توشت بوو هەرگیز تۆی لە هەڵە نابوو

و ئەوەشی تۆی لێ هەڵە بوو هەرگیز توشت نابوو.

{وَلا تَمشِ في الأرضِ مَرَحاً إِنَّ الله لا يُحِبُ كُل مُختالٍ فَخورٍ}

به لوتبەرزی و فەخر و شانازیەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ خوای گەورە لوتبەرزەکانی خۆشناوێ

ئیمامی ئەحمەد دابەزی بەرەو بازاڕی بەغداد

کۆمەڵێک تەختەی کڕی و لەسەر شانی هەلیگرت

کاتێک خەڵکی بەم شێوەیە بینیان بەخێرای بەرەو ڕووی ڕۆشتن.

دوکان دارەکان دوکانەکانیان جێهێشتن

ڕێبوارەکان وەستان سڵاوی لێ بکەن

هەمووشیان ئەیانوت بهێڵە من ئەم تەختانەت بۆ هەڵبگرم

ئەویش سور هەڵگەڕا و پڕ چاوی فرمێسک بوو و وتی:

ئێمە بەسەزمانین ئەگەر داپۆشراوی خودا نەبوایە ئاشکرا ئەبووین.

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل خۆبەکەمزانینی لە پێغەمبەری خوداوە فێربوو(صلي الله عليه وسلم )

ئەیزانی خۆی جلە دڕاوەکانی خۆی ئەدورێتەوە و پێشبڕکێی لەگەڵ عائیشەی خێزانی ئەکرد و فرمێسکی چاوی سەفیەی خێزانی ئەسڕی.

و کاتێک هاوەڵان کارەکانیان دابەش ئەکرد لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵێک،یەکێک وتی من سەری ئەبڕم ،یەکێکی تر وتی من

کەوڵی ئەکەم،پێغەمبەریش(صلي الله علیه وسلم) وتی منیش ئەچم دار کۆئەکەمەوە.

{مَا یَلفِظُ مِن قَولٍ إِلا لَدَیهِ رَقیبٌ عَتیدٌ}

هێچ وشەیەک لە دەمی مرۆڤ نایەتە دەر ئیللا ئەو دوو فریشتەیە ئاگادارن و ئەینوسن

فریشتەکان تەنها ئەوانە نانوسن کە زمانی مرۆڤەکان ئەیڵێن

ئەوانەش ئەنوسن کە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دای ئەنێی

وشەیەکی جوان ئەچێتە ڕیزی چاکەکانت

و وشەیەکی خراپ ئەچێتە لیستی خراپەکانت

و هەموو ئەوانە لە دوای مردنت لە شوێنی خۆی ئەمێنێ.

هەر لەبەر ئەوە ئەگەر پۆستەکانت بە چاکەیەکی نەبڕاوە ناژمێردرێن

لانی کەم هیچ نەبێ خراپەیەکی نەبڕاوەش جێ مەهێڵە دوای خۆت.

{لا تدري لَعَل الله يُحدِث بعد ذلك أمراً}

تۆ نازانی لەوەیە خودا لەدوای ئەمەوە شتێک بخولقێنێت

هەندێک کات سەختیەکان هێندە زۆر ئەبن لە دەوری مرۆڤ و ئەزانێت هەرگیز دەربازی نابێت لێی،

دواتریش ڕێگەی دەربازبوون لەلای خودای میهرەبانەوە ئەکرێتەوە،

کێ پێی وابوو ئەو هاجەرەیەی لە نێوان سەفا و مەڕوای ئێستادا ڕای ئەکرد و بەدوای دڵۆپ ئاو ئەگەرا بخورێتەوە،بیری ئاوی زەمزەم لەژێر قاچی کوڕەکەیدا ئەتەقێت؟؟

نەک تەنها تونیەتی ئەوانی شکاند بەڵکو هەموو میلەتێک لێی ئەخواتەوە تا ڕۆژی دوای.

پەروەردگار بەم شێوەیە لە چاوتروکانێکدا شتەکان ئەگۆڕێت،

ئیبن قەیوم ئەڵێت:هەموومان کاتی سەختمان هەبووە کە پێمان وابووە کۆتاییە بەڵام ئێستا تەنها یادگارییە.

بێ هیوا مەبە،متمانەت بە خوا هەبێت چونکە باشترین عیبادەت چاوەڕێ کردنی خۆشیەکانە.

{إذ قال يوسف لأبيه يا أبتِ إني رأيت أحد عشر كوكبًا والشمس والقمر رأيتهم لي ساجدين}

یوسف وتی باوکە من لە خەونمدا بینیم یازدە هەسارەو خۆر و مانگ سوجدەم بۆ ئەبەن

جوان لێی ورد بەوە :بەباوکی وت
بزانە نهێنیەکانت لای کێ باس ئەکەیت
هەموو مرۆڤێک جێی متمانە نییە
و هەموو بابەتێک شایەنی باسکردن نیە
بەهەموو بونتەوە تێکەڵی خەڵکی مەبە
بەشێک لە خۆت بۆ خۆت هەڵبگرە.

{قال رَب إني وهن العظم مني واشتعل الرأس شيبًا }

وتی ئەی پەروەردگارم من ئێسکەکانم لاواز بووە و سەرم سپی بوە

هەموو هۆکارەکانی دونیا بەڕووی زەکەریا وەستان

ئەو کوڕێکی ئەویست،بەڵام هەموو ڕێگاکان داخراون

ئێسکەکانی بێهێز بوون،سەری هەمووی سپی بوو،خێزانەکەی نەزۆک بوو

ئەی باشە کوڕ لە کوێ بهێنێ لەکاتێکدا هەموو ئەم بەربەستانەی هەیە؟؟

بەڵام زەکەریا ئەیزانی خودا ئەتوانێ،و کاتێک دڵی خاڵی کردەوە لەم هۆکارانە

ئەیزانی هیچ شتێک نیە خودا دەسەڵاتی بەسەریدا نەشکیت،هەر بۆیە دڵی هۆگری پەروەردگار کرد،لەوکاتە پەیامێکی جوانی بۆهات:

{يا زكريا إنا نبشرك بِغُلامٍ اسمهُ يَحيٰ}

ئەی زەکەریا ئێمە مژدەت پێ ئەدەین بە لاوێک کە ناوی یەحیایە.

هەرکەس بە متمانەوە لەگەڵ خودا بێت،خودا موعجیزەی بۆ ئەخولقێنێت.

{فافسحوا يَفسَحِ اللهُ لَكُمَ}

شوێن بۆ خەڵکی فراوان بکەنەوە لە مەجلیسەکاندا خوداش شوێن بۆ ئێوە فراوان ئەکات

ئایەتێک هاتۆتە خوارەوە لەسەر بەربڵاوی لە کۆڕەکاندا،

بەڵام لەم مانایە قوڵترە

واتا هەرکەسێک یارمەتیدەر بیت بۆ ئەو کەسانەی توشی بەڵا و موسیبەت هاتوون خوداش یارمەتیدەری ئەو ئەبێت.

هەرکەس دڵی شکاوی کەسێک چاک بکاتەوە

پەروەردگاریش دڵی شکاوی ئەو چاکدەکات

و هەرکەس دڵی کەسێک خۆشبکات

پەروەردگار دڵی خۆش ئەکات

هەرکەس ئازاری کەسێک کەم بکاتەوە

پەروەردگاریش ئازاری ئەو کەم دەکاتەوە

هەرکەس فرمێسکی چاوی کەسێک بسڕێت

پەروەردگار فرمێسکی ئەو ئەسڕێت.

هیچ کەس نیە لە خودا میهرەبان تر بێت بۆ مرۆڤەکان و هیچ کەسێکیش نییە دڵسۆزتر بێت بۆی.

چاکەکاری خراپەکان ئەسڕێتەوە

{وَكُلُهم آتيه يَومَ القيامة فَرداً}

هەمووان لە ڕۆژی قیامەتدا بە تاک دێن

بەم شێوەیە بە تەنها،تاکێک

بێ ئەو پارە و سامانەی کۆت کردۆتەوە

و بێ ئەو پلە و پایە بەرزەی هەتبوو

و بێ ئەو خێزانە گەورەیەی هەتبوو

تۆ و کردەوەکانت و پەروەردگار

ئەوکاتەی سوڵتان سلێمانی قانونی لەسەر جێگەی مردن خەوت

بەوانەی دەورو بەری وت:ئەگەر مردم دەستم لە تابوتەکەوە دەربهێنن

با خەڵکی بزانێ تەنانەت سوڵتانیش بە دەست بەتاڵی لە دونیا دەرچوو.

کێشەنیە مرۆڤ کار بۆ دونیای بکات

بەڵام بەو مەرجەی ئەو دونیای بیرنەچێ

کێشە نیەماڵێکی جوان کۆبکاتەوە

بەڵام بەو مەرجەی گۆڕی بیر نەچێ.

{قَلیلاً ما تَشکرون}

«کەمتان هەیە کە سوپاسگوزار بێت»

یەکێک لە پیاوچاکان،سەری کەچەڵ بوو

جەستەی نەخۆشی بەڵەکی هەبوو

چاوەکانی کوێر بوون،دەستەکانی و قاچەکانی ئیشیان ناکرد،هەموو کات ئەیوت:

سوپاس بۆ ئەو خودایەی ڕەحمی لێ کردووم و ئەو ئەندامانەی پێم نەداوە کە خەڵکانی تر لە ڕۆژی دوای لێپرسینەوەیان لێ ئەکرێ لەسەری.

پیاوێک بەلایدا ڕۆشت و وتی:کوێر،کەچەڵ،نەخۆش،شەلەل

ئەی خودا لەچیدا ڕەحمی لێ کردووی؟؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی:ئەی هاوار ئەی پیاو ،ئەوەتا زمانێکی پێم داوە کە یادی ئەوی پێ بکەم،و دڵێکی سوپاسگوزاری پێم داوە،و جەستەیەک کە لەسەر بەڵا و موسیبەت ئارامگرە. بەداخەوە خەڵکی پێی وایە کە تەنها پارە و سامان شایەنی سوپاسگوزارین

بەڵام بیریان ئەچێتەوە کە دوو چاویان هەیە کە ئەبینێ،لەکاتێکدا لە دونیادا خەڵکی کوێر هەن،

و ئەو دەستانەی کاریان پێ ئەکرێ،لەکاتێکدا لە دونیادا کەسانی شەلەل هەن،

و دوو قاچ کە هاتوچۆی پێ ئەکەی ،لەکاتێدا لە دونیادا کەسانێک هەن نیانە.

هەر بۆیە سوپاس بۆ تۆ خودایە.

{لَتَركبنَّ طَبقاً عَن طَبَقٍ}

«ئێوه حاڵ لەدوای حاڵ بەسەرتانا تێئەپەڕێ.

واتا حاڵتان زوو زوو ئەگۆڕێ

لەدوای ناخۆشی دڵنیابە خۆشی هەیە

لەدوای نەخۆشی دڵنیابە تەندروستی هەیە

لەدوای دابڕان دڵنیابە دیدار هەیە

ئەم دونیایە هەرگیز لەسەر یەک شێواز ناوەستێ

ژیانی خەڵکی ئاڵوگۆڕ ئەکرێ لەنێوان هەژاری و دەوڵەمەندی ،تەندروستی و نەخۆشی،خۆشی و ناخۆشی،ماڵئاوای و بەیەک شادبون.

بەختەوەر ئەو کەسەیە کە لە هەموو بارێکدا لەگەڵ خودا بێت.

{قال سآوِي إِلىٰ جَبَلٍ يَعصِمُني مِن الماء}

«وتی ئەی باوکە ئەچمە سەر یەکێک لەو شاخانە لە لافاوەکە ئەمپارێزێ و ئاوم پێ ناگات»

ئەو کەسەی لەماڵی پێغەمبەرێک گەورە بوو لە لافاوەکە نقوم بوو (کوڕی پێغەمبەر نوح)

و ئەو کەسەی لەمالی فیرعەون گەورە بوو دەریای لەت کرد بە گۆچانەکەی(پێغەمبەر موسا)

گرنگ نیە لەکوێ ئەژی بەڵکو چۆن ئەژی

سەرەتاکان گرنگ نین بەڵکو کۆتاییەکان.

{وَجَعَلني مُبارَكاً أين ما كُنت}

«و من کەسێکی موبارەک و پیرۆز و پڕ خێر و مامۆستای چاکە و بەسود ئەبم بۆ بەندەکان لە هەر شوێنێکدا بم»

گرنگ نییە لە کوێ بیت بەڵکو ئەوە گرنگە کە چۆنیت

کانزای ڕەسەن ڕۆژگار نایگۆڕێت

دەوڵەمەندی و پلەوپایە و بڕوانامە زیاتر خاکیی ئەکات

و کەسی پیس هەر پیسە چ جا پێڵاو بسڕێتەوە یان وەزیر بێت.

لە بەندیخانە بە یوسفیان وت:ئێمە تۆ بە پیاوچاک ئەزانین

و کاتێک لەسەر تەختی پاشای بوو پێیان وت :ئێمە بە پیاوچاکت ئەزانین

چاک هەر چاکە لە هەر شوێنێک بێت.

فَصكت وَجهها وَ قالت عَجوزٌ عَقيمٌ

«خێزانەکەشی لە سەرسوڕمانا بەقیژان و بانگکردن هاوار کردنەوە هات دای بەڕووی خۆیدا و وتی:من لە گەنجی منالْم نەبوو ئێستا چۆن لەم تەمەنە پیرە کە پیرەژنێکی نەزۆکم منالْم ئەبێ»

ئەمە سارا بوو ،فریشتەکان مژدەی ئیسحاقیان بۆ هێنا

لە سەر سوڕمانا ئەیدا بە دەم و چاوی و ئەیوت پیرەژنێکی نەزۆک.

چونکە ئەوەشی لە گەنجی منالْی بوبێ لە پیریدا منالْی نابێ

ئەی چۆن ئەبێ کە لە گەنجیشدا منالْی نەبوبێ ئێستا منالْی ببێ

لەوانەیە ئێستا سەیری حالْی خۆت بکەیت

و بلْێی ئەی خودا چۆن ئاواتەکان بەدی ئەهێنی ؟؟

بەلْام دلْنیابە ئەگەر پەروەردگار خێرێکی بۆ تۆ بوێ ،بۆتی ئەنێرێ تەنانەت ئەگەر لەسەر پشتی دوژمنەکەشت بێ.

{واللهُ فَضَلَ بَعضكُم عَلَىٰ بَعضٍ في الرَّزق}

«خوای گەورە فەزڵی هەندێکتانی داوە بەسەر هەندێکتاندا لە ڕزق و ڕۆزی »

خودا کاتێک سەروەت و سامان بە کەسێک ئەدا کە تاوان ئەکات مانای لاوازی ئەو نییە.

و پارە و سامانی لە کەسێکی ئیماندار نەگرتۆتەوە لەبەر هەژاری خۆی.

بەڵام ئێرە شوێنی تاقیکردنەوەیە.

پەروەردگار کە ئەبەخشێت خێری تێدایە و کە لێتی وەرئەگرێتەوە هەر خێری تێدایە.

ئەوەی هی تۆ بێ هەر پێت ئەگات،

ئەگەر هەموو دونیاش ڕێگر بێت،

ئەوەشی بۆ تۆ نەبێ ئەگەر هەموو دونیا هەوڵ بدات پێت بدات بەدەستی ناهێنی.

قەڵەمەکە بەرزکراوەتەوە و پەڕەکان وشک بونەوە.

{يا يحييٰ خُذ الكِتابَ بِقُوةٍ}

«ئەی یەحیا ئەو کتابەی بۆت دێت ،یاخود تەورات بەجددی و هێز و عەزیمەت و کۆششەوە و بەجوانی بیگرە»

هێزی دەست و جەست نا

بەڵکو هێزی دڵ و بیر وبڕوا

و تۆش کتێبەکە بەهێزەوە بگرە

ڕاستگۆبە و ئیمانێکی جێگرت هەبێ لە بیر و باوەڕت.

ئەگەر هەموو کەس لار بونەوە،تۆ جێگیر بە

و ئەگەر هەمووکەس کەوتن ،تۆ واز لە چاکەی خۆت مەهێنە

ئەم ئاینە براوەیە ئەگەر تۆی لەگەڵ بیت،یان بێ تۆ بێت.

تەنها تۆی خەسارەت مەند ئەبی ئەگەر کاروانەکە نڕێ کەوت و تۆی تیا نەبووی.

{المال و البنون زِينةُ الحياة الدنيا }

«منداڵ و ماڵ و جوانی و ڕازاوەیی ژیانی دونیان»

ژیان لەگەڵ پارە ئاسانترە

و بە منداڵەوە جوانترە

بەڵام لە واتای ئایەتەکە ورد بەوە ئەڵێ:ڕازاوەیی

نەک نرخ

مرۆڤ بەوە دیاری ئەکرێ کە ئەیزانێ نەک بەوەی خاوەنیەتی

و بەوەی ناو دڵی نەک گیرفانی

بەمیهرەبانی نەک دەسەڵاتی

بە نەرم و نیانی نەک دڵڕەقی

وەک ئەوانە مەبە کە حەسودیان بە قارون ئەبرد لەبەر ماڵ و سامانەکەی

ئەوکاتەی هەموو شتێکی نەما ڕاستیەکەیان زانی

تۆ لە سەرەتاوە بیزانە.

{لاتحسبوه شرًّا لكُم بل هوَ خَيرٌ}

«وا مەزانن کە ئەمە شەڕ و خراپە بێت بۆتان بەڵکو بەهۆیەوە ئەجر و پاداشتی زۆر وەرئەگرن،و ئەمە خێر و چاکەیە بۆتان و بە خێر بەسەرتان ئەشکێتەوە»

میهرەبانیەکانی خودا زۆرن و ئێمە نازانین

هەموو خراپەیەکیش بەسەرمان بێت خێرێکی تێدایە کە دواتر ئەیزانین

کەشتیەکە لە سورەتی کهف ئەگەر کون نەکرایە پاشا زۆردارەکە ئەیبرد

هەژارەکانیش سەرچاوەی ڕسق و ڕۆزیان لەدەس ئەچوو

پیاوەکە ئەگەر نەکوژرایە،دایک و باوکی ماندوو ئەکرد

تەنانەت دیوارەکەش ئەگەر چاک نەکرایە مافی دوو هەتیوەکە ئەفەوتا

متمانەت بە پەروەردگار هەبێ ،خودای باشەکان تەنها باشە دێنێتە ڕێت

{يُدبِر الامر مِن السماء الى الأرض}

«خودای گەورە کار و باری ئەم بونەوەرە هەڵئەسوڕێنێ و لە ئاسمانەوە بڕیار ئەدات بۆ زەوی.»

خودای گەورە کارو بار هەڵئەسوڕێنێ ،ئیتر بۆ دوو دڵی

پشت ببەستە بە دڵنیاییەکەت لە خودا

ئەو نەخۆشیەی بەسەرت کەوتووە ،چارەسەری لای خودایە

ئەو قەرزەی کە ماندووی کردووی،دانەوەی لای خوداوەیە.

ئەو خەم و خەفەتەی ژیانی لێ قورس کردووی،نەهێشتنی لای خوداوەیە

هەمیشە بچۆ دەرکای ئەو.

کەسێکی بەخشندە و میهرەبان داواکاری خەڵکی جێبەجێ ئەکات،ئەی چی دەربارەی خودا.

{هذا ما تُعدون لِكل أوابٍ حَفيظ}

«ئەمە ئەو بەڵێنانەیە کە پێتان دراوە بۆ هەمووکەسێک کە بۆلای خوای گەورە گەڕابێتەوە بە تەوبە کردن و دەست هەڵگرتن لە تاوان ،تاوانەکانی خۆی پاراستبێ و لەبیری نەکردبێ و تەوبەی لێ کردبێت و ڕووی کردبێتە خودا و بەگوێڕایەڵی کردنی یان بەڵێن و پەیمانی پاراستبێ و هەڵینەوەشاندبێتەوە.»

وشەی (الأواب) لە زمانی عەرەبی زیادەڕۆی لێ کراوە

و لە واتایدا:کەسێک زۆر تۆبەی کردبێت بۆ خودا

کورتی ئایەتەکە ئەڵێت:

ئەگەر تاوانی زۆری نەبوبێ،تەوبەی زۆریشی نابێ

نەکەی هەرگیز تاوانەکانت بە گەورە بزانی بەرانبەر میهرەبانی خودا.

و نەکەی بە کەمی بزانی بەرانبەر سزای خودا

لەنێوان تکا و ترسدا بمێنەوە

تکایەک بۆ میهرەبانی و ترس لە سزاکانی

نەکەی هەرگیز شەیتان وات لێ بکا شەرم لە تاوانەکەت بکەی و نەگەڕێیتەوە لای خودا

ئەو ناوی خۆی ناوە (غفور) لێخۆشبوو :چونکە تاوان ئەکەین و ئەگەڕێینەوە و لێمان خۆش ئەبێ

ئەگەر لە ڕۆژێکدا هەزار تاوانت کرد

هەزار جاریش داوای لێ خۆشبون بکە

هەرکەس دڵی بە هۆکارەکانی دونیا هۆگر کرد

خوداش بۆ دونیای جێئەهێڵێت

هەرکەسیش دڵی هۆگری خودا کرد

خودا هۆکارەکانی بۆ ئاسان ئەکا

{ذكرُ رَحمتِ رَبِكَ عَبدهُ زَكريا}

«بەسەرهاتی زەکەریا پێغەمبەر،باسی ڕەحمەتی پەروەردگارتە بۆ بەندە و پێغەمبەر خۆی زەکەریا ،کە یەکێک بوو لە پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل،دارتاش بووە خێزانەکەی خوشکی مەریەم بوو دایکی عیسا. »

زەکەریا لای خەڵکی دارتاش بوو

بەڵام لای خودا پێغەمبەر و نێردراوی خودا بوو

نرخت لە کارەکەت و بڕوا نامەکەت نیە

نرخت لەلای خودایە

لە حەدیسێک هاتووە:هەموو پێغەمبەران شوانیان کردوە

وتیان:تۆش پێغەمبەری خودا؟

فەرمووی منیش شوانیم بۆ قوڕەیشکان ئەکرد بە کرێ

هەرگیز شەرم لە کارەکەت و پێگەکەت مەکە.

ئەگەر پارووی حەڵاڵ ئەخۆی ،شانازی پێوە بکە

{الذين اتبعوه في ساعة العُسرة}

«ئەوانەی شوێن پێغەمبەری خوا کەوتن لە غەزای تەبوک کە لەکاتی تەنگانەدا کە کاتێکی یەکجار گەرم بو خواردنیان کەم پێ مابوو بە ڕادەیەک خورمایان لەت ئەکرد و ئاو نەبوو زۆر تینوو بوون و دوژمنیش زۆر بەهێز بوو»

ئەم ئایەتە بۆ هاوەڵان دابەزی لە غەزای تەبوک

یەکێک لە قورسترین غەزاکان بوو و دورترین مەودای هەبوو

کەشێکی گەرمی هاوین و لە بیابان

سوپاکە ناو نران بە سوپای سەختی

چونکە پارە و سامان نەبوو تا سوپاکە ئامادە بکرێت،لەگەل هەموو ئەمانە خودا هەموو ئەم ناخۆشیانەی بە سەختی ناوبرد.

کات زوو ئەڕوات

ڕۆژەکان وەکو با ئەگۆڕێن

چاکەکاری و خودا پەرستی تەنها پاداشتی ئەمێنێتەوە

تاوانیش تەنها سزاکەی ئەمێنێتەوە

لەم کاتە سەختانە ئەیانوت:ڕۆژانێکن و تێئەپەڕن ، لەبەهەشت یەک ئەبینینەوە.

{من عَمَلَ صالِحاً من ذَكرٍ أو أُنثىٰ وَ هو مؤمِن فلنُحيِيهُ حياةًَ طيبة}

«هەرکەسێک کردەوەی چاک بکات ئەگەر پیاو بێت یان ئافرەت بە بەمەرجێک باوەڕدار بێت ئەوە ئەیژیەنین ژیانێکی زۆر خۆش قەناعەت و ڕسقی حەڵالی ئەدەینێ بەختەوەر و سەرکەوتوی ئەکەین لە دونیادا»

سعیدی کوڕی جبیر ئەڵێت:

ژیانێکی باش ئەوەیە کە خودا پێویستی مرۆڤت نەکات.

ئەمەش قسەی ئازیزمانە:

ژیانی باش ئەوە نیە نەخۆش نەکەوی و هەژار نەبی

و ئەوە نیە خاوەن پلە و پایە بیت

بەڵکو ئەوەیە ڕازی بیت بەو ژیانەی خودا پێی داوی هەرچۆنێک بێت

هەرکات خودا ڕازی کردی بە قەدەرەکانی

سوپاسگوزاری کردی،ئارامگری کردی لەسەر سەختیەکان

ئەوە ژیانێکی باشی پێ داوی.

لقد خلقنا الانسان في احسن تقويم

«بێ گومان مرۆڤمان لە جوانترین شێوە و شێواز دروست کردووە»

جوانترین شێوەو شێواز مانای قۆز و قژ زەرد نیە

بەڵکو لە جەستەدا کە وەکو موعجیزە کار ئەکات

جوانی وەکو پارە و سامان ڕسقە،خودا بە دانایی دابەشی کردووە بەسەر مرۆڤەکان

لوقمانی حەکیم تەنها بەندەیەک بوو

بیلالی کوڕی ڕەباح ڕەشپێست بوو

بەڵام هیچ زیانێکی نەبوو بۆیان

سودی جوانی و قۆزی چییە لە دڵەکاندا لە کاتێکدا ئاگر ئەیخوات

هەرگیز گاڵتە بە شێوە و ڕوخساری کەس مەکە

تۆش خۆت خۆتت دروست نەکردوە

ئەگەر ڕێزی دروستکراوەکانیش ناگری،بەڕێزبە بەرانبەر دروستکەر.

وا مەکە کەسێک ڕقی لە شێوە و ڕوخساری خۆی بێت،تەنها بۆ پێکەنین و خۆشی خۆت

هەندێک جار زمان زیاتر لە شمشێر ئازار دەرە.

{خَلِقَ الإِنسانُ من عَجَلٍ}

«مرۆڤ هەر لە دروست کردنەوە سروشتی وایە کە پەلەیەتی»

بەم شێوەیە دروست کراوین ،بەرگەی چاوەڕوانی ناگرین

تەنانەت ئێمە گەورەش ،وەکو ئەو منداڵانە واین کە کاتێک بەڵێنی شتێکیان پێ ئەدەین ئیتر هەموو دەقەیەک پێمان ئەڵێنەوە.

ئەم پەلە پەلە بە ئارامگری ئارام بکەنەوە.

هەندێک شت هەن هێندە پەلەی لێ ئەکەین بە دەستی ناهێنین بەهۆی پەلە کردنمان.

جەعفەری کوڕی ئەبی عثمان ئەڵێ:

لەلای یەحیای کوڕی موعین بوین،پیاوێک هاتە لای بە پەلە بوو

وتی :ئەی باوکی زەکەریا شتێکم پێ بڵی تۆی پێ بناسمەوە

ئەویش وتی:بەوە بیرت بێ کە داوات لێکردم قسەت بۆ بکەم و نەمکرد

ئەیویست پێی بڵێ زانست بە پەلە پەل ناگات بە کەس.

{وما آمن مَعهُ إِلا قَلِيلٌ}

«و تەنها کەسانێکی کەم باوەڕیان پێ هێناوە»

ئەو زانای پەیامبەران بوو نوح بوو

لە هەزار ساڵ پەنجا ساڵی کەم بوو ئەوەنە بانگەوازی کرد

تەنها کەسانێکی کەمیش باوەڕیان پێ هێنا

ئێمە بەرپرسیارین لەسەر هەوڵدان نەک ئەنجام

لەسەر ئەو ڕێگەی لەسەری ئەڕۆین نەک گەشتنمان

لە حەدیسێکدا هاتووە :پێغەمبەرێک دێت هیچ کەسی لەگەڵ نیە

چونکە لە ڕۆژی دوایدا هەر پێغەمبەرێک و میلەتەکەی خۆی لەگەڵ ئەبێت

و هەندێک هەن کەس باوڕی پێ نەهێناون

ئیمامی ئەوزاعی ئەڵێ

عەتای کوڕی ئەبی رەباح مرد باشترین زانای سەر زەوی بوو کەچی کۆڕەکەی تەنها نۆ کەسی تێدابوو.

{ادع إِلىٰ سبيل رَبِك بالحِكمة و الموعِظة الحَسَنة}

«تۆ بانگەوزای خەڵکی بکە بۆ ڕێگەی ڕاستی خوای گەورە بە حیکمەتەوە و بە ئامۆژگاری جوان»

هەرچەند تۆ ڕاست بویت و کەسی بەرانبەر هەڵە بوو

هەرچەن تۆ لەسەر ڕێی ڕاست بوویت و کەسی بەامبەر نەزان بوو

ڕەوشت لەپێش هەموو شتێکە

دزێک چووە مالکی و کوڕی دینار ،هیچی دەست نەکەوت بیدزێ

مالک بانگی کرد و وتی هیچ شتێکی دونیات دەست نەکەوت بیبەیت ئایا شتێکت ئەوێ بۆ ئەو دنیات،؟

ئەویش وتی بەڵێ

مالک وتی: دەستنوێژ بگرە و دوو رکات نوێژ بکە

کردی دواتر کەمێک دانیشت و لەگەڵ خۆی بردی بۆ مزگەوت

کاتێک پرسیاری ئەم پیاوەیان لە مالک کرد وتی:هات دزی بکات ، کەچی ئێمە دزیمان لێ کرد.

{عَرَف بَعضهُ وأعرض عن بعضٍ}

هەندێک جار ئەبێ بێدەنگ بیت

لەبەر ئەوەی هەندێک کێشە قسە چارەی ناکا

ظوا خۆت دەرخە نازانیت

وا خۆت دەرخە نەتدیوە

وا ڕەفتار کە کە گوێت لێ نەبوە

و ببەخشە وەک ئەوی تێنەگەشتبی

پیاوێک چووە لات خەلیفە مەهدی بینی نەعلێکی پێیە و وتی ئەمە هی پێغەمبەرە (صلي الله عليه وسلم)

مەهدیش نەعلەکانی هەڵگرت و ماچی کرد دە هەزار درهەمی دا بە پیاوەکە

کاتێک پیاوەکە ڕۆشت وتی ئەزانم پێغەمبەر ئەم نەعلانەی لە ژیانیا نەبینیوە و لەپێی نەکردووە بەڵام ئەگەر بە درۆم بخستایەوە ئەڕۆشت و لای خەڵکی ئەیوت پێڵاوی پێغەمبەرم بۆ مەهدی هێنا و ڕەتی کردەوە.

{إن تمسسكم حَسَنةُ تسؤهم وًإن تُصِبكُم سَيئة يفرحوا بها}

«ئەگەر هەر چاکەیەک توشتی ئێوە بێ لە سەرکەوتن و بەهێزبوون ئەوان پێیان ناخۆشه و خەفەتبار ئەبن،و ئەگەر توشی خراپەیەکیش بن لە نەبونی یان تێک شکان لە شەڕدا ئەوان دڵخۆش ئەبن پێی »

دڵخۆش بوون بە بەڵای کەسانی تر سیفەتی دوو ڕووەکانه

هەر لەبەر ئەوه چۆن حەزت لە خێری خۆت هەیه بۆ هەموو کەس ئەوها به

و ڕقتان لە ئازار و نەهامەتی بێت بۆیان وەک خۆتان

یەکێک لە زاناکانی سەردەمی خۆی ئەڵێ:

سی ساڵ ئەبێت من داوای لێخۆشبون ئەکەم چونکه وتومە سوپاس خودایه

وتیان چۆن؟

وتی لە بەغداد ئاگرێک کەوتەوە چووم سەیری دوکانەکەم بکەم

پیاوێک پێی وتم :دوکانەکەت سەلامەته

منیش وتم سوپاس بۆ خوا

لەوکاتەوە پەشیمانم چونکە خێری خۆم ویست و خێری خەڵکم لا گرنگ نەبوو

{وَما الحياة الدُنيا إِلا مَتاعُ الغُرورِ}

«ژیانی دونیا هیچ نییە تەنها شتومەکێکە و مرۆڤ پێی لە خشتە ئەبرێ و لە ڕێگای ڕاست دەرئەچێ لە خوای گەورە دورئەکەوێتەوە پێی ئەگەر وریا نەبێت»

ژیانی دونیا تەنها خۆشیەک و هەوەسبازییەکی کاتییە ئەمە ڕاستیە بۆ ئەو کەسانەی وریا بن.

هاوڕێی کەس نییە و لە کۆتای ڕێگەکە دەست لە هەمووومان بەرئەدا

مرۆڤی ئاقڵ کەسێکە واز لە دونیا بهێنێ پێش ئەوەی دونیا واز لەو بهێنێ.

کاتێک عومەری کوڕی خەتاب هاتە شام بە ئەبی عوبەیدەی وت بمانبە بۆ ماڵەکەی خۆت

ئەویش وتی :مەگەر بتەوێ بگری بۆ حاڵم

کاتێک عومەر چووە ماڵیان پرسی: کوا کەل و پەلەکانت؟کوا خۆشیەکانت؟

ئەبی عوبەیدە وتی:هەر ئەوەنەم هەیە کە ئەیبینی

عومەر وتی:ئەی خۆراک؟

ئەبوعوبەیدە قاپێکی هێنا و هەندێک نانی تێدابوو

عومەر گریا و وتی هەمووومان خۆشیەکانی دونیا گۆڕیمانی تەنها تۆ نەبێ ئەبی عوبەیدە

ئەبوو عوبەیدە ئەوکات خەلیفەی موسڵمانان بوو لە شام.

{فدعا رَبَّهُ أَنّي مَغلوبٌ فَانتصِرْ}

«نوحیش لە خوای گەورە پاڕایەوە :ئەی پەروەردگار ئەوان زاڵ بوونە بەسەر مندا و من توانای ئەوانم نیە تۆ تۆڵەیان لێ بسەنەو دینەکەی خۆت سەربخە»

لە دوعای ئەو کەسانە بترسە کە جگە لە خودا کەسیان نییە

ئەو کرێکارە بەسەزمانەی کرێکەیت خوارد

ئەو برایەی بەشە میراتەکەت پێ نەدا

ئەو دراوسێیەی زەویەکەیت بەزاند

لەوانەیە تۆ ئەو شەوە خەوتبی

و ئەویش هەستا بێت و بە دەستنوێژەوە پاڕابێتەوە وەک ئەم پاڕانەوەی نوح

پەروەردگاریش پاڕانەوەی ستەملێ کراوێکی وەرگرتبێت

و فەرمانی بە فریشتەکانی کردبێت ئەو سەربخەن بەسەرتدا

جەعفەری بەرمەکی لە بەندیخانە لە باوکی پرسی

ئەی باوکە ئایا دوای فەرمان کرد و ڕەتکردنەوە و پارە و سامان گەشتین نە ئێرە؟

ئەویش وتی کوڕم ئێمە پاڕانەوەی ستەملێکراوەکانمان ئیهمال کرد بەڵام خودا پشتگوێی نەخست.

{فأثابهم الله بِما قالوا}

{وَلُعنوا بِما قالوا}

«بەهۆی ئەم قسە و ئیمان هێنان و بەڕاست دانانی پێغەمبەر خوای گەورە پاداشتیان ئەداتەوە»

«نەفرەتی خوای گەورەیان لێكرا بەهۆی قسە خراپەكانیان كە بەرانبەر خوای گەورەیان كرد»

هەرگیز وشە بە كەم مەزانە

یەک وشە ئەتوانێ بتخاتە بەهەشتەوە

و وشەیەكی تر بتبات بۆ دۆزەخ

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە موعازی وت لەكاتێكدا ئاماژەی بۆ زمانی ئەكرد:

دەست بەمەوە بگرە

موعاز وتی:ئایا ئێمە كەمتەرخەمین بەرانبەر قسەكانمان ئەی پێغەمبەری خوا؟؟

پێغەمبەر فەرمووی:دایكت ئاگادارت بێ ئەی موعاز

ئایا خەڵكی لە دۆزەخدا تەنها باجی قسەی زمانیان نادەن؟

{قال يابُني لا تقصُص رُؤياكَ عَلَىٰ إِخوَتِكَ فَيكيدُوا لَكَ كَيداً}

«باوکی پێی فەرموو ئەی کوڕی خۆم ئەم خەوە بۆ براکانت مەگێڕەوە نەوەکو ئەوانیش لێکدانەوەکەی بزانن دواتر لە حەسودیدا نەخشەو پلانت بۆ دابنێن و لەناوتبەرن »

باسی هەموو ئەو شتانە مەکە لای هەمووکەس کە خودا پێی داوی

هەندێک دەرون نەخۆشە

و هەندێک چاو ژەهراوین

بە سوپاسگوزاری و شاردنەوەی بەرگری لە باشیەکانی خودا بکە

یان لانی کەم لای هەموو کەس باسی مەکە

چونکە حەسود هیچ شتێک هێندەی نەمانی نیعمەت دڵخۆشی ناکا

لە کۆندا برا حەسودی بە براکەی هات لەبەر خەونێک تۆ ئەتەوێ پارێزراو بی لە خەڵک؟

{يَومِئذٍ تُحدِثُ أخبارَها }

«لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی باس ئەکات»

هەرشوێنێک کە خواپەرستیت لێ کردبێ شایەتیت بۆ ئەدات

و هەر شوێنێکیش بێ فەرمانی خودات لێ کردبێ شایەتیت بۆ ئەدات

شایەتەکانت زۆر بکە

وابکە چوویتە هەر شوێنێک سوجدەیەکت لێی هەبێ

و هەر شارێک چووی بۆی خێرێکت لێی هەبێ

و هەر ناوچەیەک چووی بۆی سەردانی مزگەوتێکت هەبێ

ئەم زەویە تەنها خاک و خۆڵ نیە

بەڵکو شایەتی سەرەکیە لە دادپەروەرترین دادگای گەردون

دادگای پەروەردگار.

{فَلَمَّا جاء أمْرُنا نَجَينا صالِحاً والذين آمنوا مَعهُ بِرَحمةٍ منا}

«سالح و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵی بوون بە ڕەحمەتی خۆمان ڕزگارمان کردن لەسەر شۆڕی و سزای ئەو ڕۆژە»

جوان لێی وردبەوە«بە ڕەحمەتی خۆمان»

هەر بۆیە ئەگەر دوای ناخۆشی خۆشی هات ئەوە بە ڕەحمەتی خودایە

و ئەگەر چارەسەرت بۆهات دوای نەخۆشی

بەهۆی دەرمان و دکتۆر نییە بەڵکو ڕەحمەتی خودایە

و ئەگەر کارت دەستکەوت دوای ماوەیەک بێ کاری ئەوە بەهۆی بڕوانامە و شارەزایت نییە بەڵکو بە ڕەحمەتی خودایە

و ئەگەر منداڵت بۆهات دوای ماوەیەک دابڕان لێی ئەوە بەهۆی دەرمان و هێزی خۆت نیە بەڵکو ڕەحمەتی خودایە

هەموو ئەم هۆکارانە نە سود و نە زیانی نیە تاکو خودا نەیەوێ

زۆر نەخۆش هەن سەرەڕای دەرمان وەرگرتن چارەسەر نەبوون

و چەند خاوەن بڕوانامە بێ کارە

و چەن هاوسەر هەن بێ منداڵن

هەموو خێرێک کە تۆی تێدای بە ڕەحمەتی خودایە،دان بە نیعمەتەکان بنێ لەلای خاوەنی نیعمەتەکە.

{ولقد آتينا داوود مِنا فَضلاً يا جِبالُ أوبي معهُ والطيرَ وَألنا لهُ الحديد}

«بەدڵنیای ئێمە فەزڵ و چاکەی خۆمان بە داود پێغەمبەر بەخشی کە پێغەمبەرایەتی و زەبوور  و موڵک و سەرباز و دەنگخۆشی. وچەند شتی تریش بوون»

لەگەڵ خودا بە،خوداش لەگەڵت ئەبێ

مەپرسە کەی ، لەکوێ ،چۆن؟

ئەو زاتەی ئاسنی بۆ داود نەرم کرد

ئایا ناتوانێ دڵی خەڵکت بۆ نەرم بکا؟

ئەو زاتەی چیا و باڵندەکانی هان دا وەڵامی داود بدەنەوە

قورس نیە لای تۆش لای خەڵک قبوڵ بکات

تۆ خودا ئەپەرستی ئەویش بەڵێنی سەرکەوتنت پێ ئەدا

ئەوە پێشکەشی خودا بکە کە ئەیەوێ،ئەویش ئەوەت پێ ئەبەخشێ کە خۆشتئەوێ.

و لما بلغ أشدهُ واستوىٰ آتيناهُ حُكماً و عِلماً

« و کاتێک موسا بالغ بوو و پێگەشت و دروستکردنی ڕێک و دامەزراو بوو حوکممان پێی بەخشی »

هەندێک شت هەیە پێویستە پێش ئەوەی بەدەستی بهێنی پێبگەیت

چونکە ئەگەر زوو بەدەستی بهێنی زووش لەدەستی ئەدەی

ئەو زاتەی موسڵمانەکانی سەرخست لە شەڕی بەدر،خۆ ئەیواتی لە مەککە سەریان بخات ئەوکاتەی لاواز بوون

بەڵام سەرکەوتی دواخست تا فێریان بکات

تا پێبگەن ،و بزانن ئەو پەیامەی هەڵیانگرتووە زۆر لە قوڕەیش گەورەترە

پەیامی یەکتاپەرستییە کە بۆ هەموو گەردون بۆ ئەو پەیامە دروست بووە

ئازیزم:ئەگەر هێلکەیەک بشکێنین پێش پێگەشتنی تەواوی ئەوی ناوی ئەمرێ

ئەگەر زوو گەنم بدورێتەوە ناکرێ بە نان

ئەو خواردنەی بەشی خۆی لە ئاگر وەرنەگرێ کاڵ دەرئەچێ و ناخورێ.

هەمووشتێ کاتی خۆی هەیە پەلەت نەبێ.

{إِنَّ أجري إلاَ عَلَىٰ الله}

«ئەجر و پاداشتی من تەنها لای پەروەردگارە»

پرسیار لە زانایەک کرا:ئەیا هەیە لە ڕەزیلی ناشرینتر؟

فەرمووی :بەڵێ،چاکەکار  ئەگەر باسی چاکەی خۆی بکات

خودا لەبەر چاوت دانێ بۆ هەموو خێرێک کە ئەیکەیت

چاوەڕێی پاداشت لە کەس مەکە

و چاوەڕێی باچاکە باسکردنت مەکە

هەرکارێک نیازت بۆ خەڵک بووبێ هەر بۆ خەڵکە

و هەرکارێک بە نیازی خودا بیکەی هەر بۆ خودایە

وتەیەکی ئیبن قەیم زۆر ترسناکە ئەڵێت:

ئەگەر بەدڵسۆزیەوە نەتکرد ئەوە خۆت ماندوو مەکە.

{وما تسقُط من ورقةٍ إلا يعلمُها}

«گەڵای هیچ دارێک هەڵناوەرێ ئیللا خوای گەورە زانیاری پێیە گەڵای ئەو دارە کەی پێئەگات و کەی زەرد ئەبێ و کەی هەڵئەوەرێ»

ئەی چی لەبارەی ئەو خێرەی لە دڵی تۆدایە؟

ئەی لەبارەی ئەو خۆشەویستیەت بۆ خەڵکی؟

ئەی چی لەبارەی دڵخۆشیت بۆ سەرکەوتنی خەڵک وەک ئەوەی سەرکەوتنی خۆت بێ؟

ئەی چی لەبارەی ئازارت کاتێک ئازاری کەسێک ئەبینی وەک ئەوەی ئازاری خۆت بێ؟

هاوڕێکەم،پەروەردگار لە ئاسمانەوە سەیری ئێمە ناکات

بەڵکو لا ناخەوە سەیرمان ئەکات

ناخت چاک بکە

«شوێنێک هەیە لە جەستەدا ئەگەر باش بێت هەموو جەستە باش ئەبێت،

و ئەگەر خراپ بێت هەموو جەستە خراپ ئەبێ

ئەویش دڵە.

{يالَيتني قَّدَمتُ لِحياتي}

«خۆزگە بۆ ئەم ژیانەی ئەم دونیام کردەوەی چاکم پێشکەشبکردایە »

ئەمە ئاواتی ئەو کەسانەیە کە لە گۆڕدان

خۆزگە کردەوەی باشم بکردایە

نەک بڵێ خۆزگە زیاتر بژیمایە

چونکە ژیانی ڕاستیمان هێشتا دەستی پێ نەکردووە

ژیان لەو کاتەوە دەست پێ ئەکات کە ئەخرێینە گۆڕەوە

ئەوکات یان باخێک لا باخەکانی بەهەشت

یانیش چاڵێک لە چاڵەکانی دۆزەخ

سا ئەگەر کردەوەی چاک ئاواتی کەسانی ناو گۆڕ بێت

تۆ ئێستا لەو ئاواتەدایت،کردەوەی چاک بکە

حەسەنی بەسری ڕۆژێک لەسەر گۆڕێک وەستابوو

فەمووی ئەزانن ئاواتی ئەم کەسە چیە ئێستا؟

خەڵکی چوار دەوری وتیان :نگەڕێتەوە و کاری باش بکات

ئەویش فەرمووی:ئێوە ئێستا لەو ئاواتەی ئەودان کەواتە ئێوە بیکەن.

{وَما تَدري نَفسٌ مّاذا تَكْسِبُ غَداً}

«هیچ کەس نازانێ سبەی چی بەسەردێت  و چی بەدەست دێنێ لە کاروباری دین و دونیای چونکە غەیبە و خوا نەبێ هێچ کەس غەیب نازانێ »

دودڵ مەبە بۆ داهاتوو

هەوڵبە ڕەزامەندی خودا بەدەست بهێنی و خەمت نەبێ

داهاتوو تەنها بەدەست خودایە

ڕسقی تۆ بۆ هیچ کەسی تر ناروات

بەڵام خودا پەرستیت جگە لە خۆت کەسی تر بۆت ناکات

خودات بەسە بۆ پێدانی ڕسقت

بەڵام داوای هەوڵی لێ کردووی

هەر لەبەر ئەوە هێندە سەرقاڵی دونیا مەبە کە خودا خۆی پێت ئەبەخشی

کە خودا پەرستی لەبیر بکەیت لە خودا لێتی داوا ئەکات

{فأَثَابَكُم غَمَّاً بِغَمٌّ}

«توشی خەم و پەژارەتان ئەکا لەسەر خەم و پەژارە »

تاقیتئەکاتەوە بە لەدەستدان تا بزانیت جگە لە خودا هیچت بۆ نامێنێتەوە

و تاقیتئەکاتەوە بە بێ هیوا بوون تا بزانیت ئارامی و دڵنیای تەنها لای ئەوە

بە کەوتن تاقیتئەکاتەوە تا بزانی هەر ئەوە هەڵتئەسێنێتەوە

بەڵا و موسیبەت هەمووکات بۆ تۆڵە سەندنەوە نییە

زۆربەی بۆ ئاقڵکردن و ڕاستکردنەوەی ڕێگایە.

{لا يُكَلِف الله نَفساً إلا وُسعها}

«خواى گەورە ئەرک ناخاتە سەر شانى هيچ کەسێک ئيللا بە گوێرەى تواناى خۆى نەبێ»

خودا ميوەيەک ناخاتە سەر لقێک کە تواناى هەڵگرتنى نەبێ

هەر مەسئولياتێک خستيەتێ سەر شانت تۆ توانايت هەيە

هەر جەنگێک تۆى خستبێتە ناوەڕاستى تۆ توانايت هەيە

هەر خەم و دڵتەنگيەک توشتبووە

لە تواناتدا هەيە بەرگەى بگرى

سەختى و بەڵاکان بەهێزت ئەکەن

شوێنەکەى خۆت جێ مەهێڵە.

{فلولا أنهُ كَانَ مِنَ المُسَبحِينَ لَلبِث في بَطنِهِ إِلَىٰ يَومِ يُبعَثونَ}

« ئەگەر یونس لەناو سکی حوتەکە تەسبیحاتی خودای نەکردایە یان نوێژی نەکردایە ئەوا لەناو سکی ئەو نەهەنگە ئەمایەوە تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە »

لەکاتی سەرفرازی یادی خودای ئەکرد

لەکاتی سەختیشدا هەر یادی ئەکرد

کەس نیە لە خودا دڵسۆزتر بێت

لەلای خودا کردەوەی چاک بۆ خۆت هەڵبگرە

تەنانەت ئەگەر کەوتیتە سەختیشەوە

خودا چاکەکانت ئەزانێ و ڕزگارگ ئەکات.

{فَصَبَرٌ جَمِيلٌ}

«ئارامگرتنێكی جوان ئارام بگرن»

ئارامبگره هاوڕێکەم،یادی خودا بکە

،نوێژەکانت بکە ،ئازارەکانت هەڵبگره

چونکە ئەوە تەنها قەدەری خودایە

ژیانی دونیا تەنها تاقیکردنەوەیەکە و تێدەپەڕێت

وێستگەیەکە کە تا کۆتای تونێلەکە لێی ئەمێنینەوە

دڵنیابە

ڕۆژێک دێت لەژێر سێبەری دارێک لە دارەکانی بەهەشت دائەنیشین

لەسەر ژیان و ناخۆشیەکانی دونیا پێدەکەنین

{وَجَزاهُم بِما صَبَروا جَنةً وَ حَريراً}

«خوای گەورە پاداشتیان دەداتەوە بە بەهەشت بەهۆی ئەوەی لە دونیا ئارامیان گرتووە لەسەر وازهێنان لە شەهوەت و بەردەوام بوون لەسەر گوێڕایەڵی و ئارامگرتن لەسەر بەڵا و ناخۆشیەکان »

ئەمە لەبەر ئەوەی نوێژی بەیانی سەختە

و بەڕۆژووبوون ماندوکەرە

و حەج کردن ئازاردەرە

و قسەی هەق مەترسیدارە

و شەهوەت بەرگەگرتنی سەختە

و پارە خۆشەویستە

و متمانەبوون سەختترە لە خیانەت

و چاوپۆشین لە ئارەزووەکان

و نەفس داوای خراپە ئەکا

ڕێگەی بەهەشت پڕە لە دڕک

لەکاتێکدا ڕێگەی دۆزەخ زۆر خۆشە

{مِنها خَلَقناكُم و فيها نُعِيدُكُم}

«لەو زەوی و خۆڵە دروستمان کردوون پاشانیش ئەتانگەڕێنینەوە بۆ ناو زەوی کە مردن»

ژیانێکی چڕ:

زانست،کارکردن،هاوسەرگیری،منداڵ،کۆکردنەوەی پارە،دواتر چی؟

دواتر خۆڵمان بەسەرا ئەکەن و ئەڕۆن

گەشتەکە دەستپێ ئەکات

یان بۆ بەهەشت یان دۆزەخ

دونیا تەنها ڕێڕەوێکە بەرەو کۆتایمان ئەبات

ڕێڕەوی خۆت باش هەڵبژێرە.

{وَلَقَد نَعْلَمُ أَنَكَ يَضيقُ صَدرُكَ بِما يَقولُونَ}

«ئێمە ئەزانین کە تۆ دڵت تەنگ ئەبێ بەوەی کە ئەوان سەبارەت بەتۆ ئەیڵێن وە تۆمەتبارت ئەکەن »

یەک وشەی ناخۆش ئازاری دا

دڵی تەنگ بوو بە قسەی خراپ

لەکاتێکدا ئەو پێغەمبەرە

ئەی ئەو کەسانە چی کە وەک ئەو نین

ڕەحمەت،ڕەحمەت،ڕەحمەت

لەو کەسانەی وشەکانیان بەباشی هەڵئەبژێرن

هەر وەک چۆن جل و بەرگیان هەڵئەبژێرن

لەبەر ئەوەی ئەزانن قسەکردنیش

ڕێکپۆشی پێویستە.

هۆکار:{فأما مَنْ أَعطی وَاتَّقَی}

ئەنجام:{فَسَنُیَسِرُهُ لِلُیُسرَی}

«هەرکەس ئەوماڵەی کە هەیەتی لەپێناو خودا بیبەخشێت و تەقوای خوای گەورە بکات و خۆی لە حەرام بپارێزێ»

«ئەوکات ئێمەش کاری چاکە و خێری بۆ ئاسان ئەکەین»

ئەگەر دونیا زۆر تەنگ بوو لێت،ببەخشە لە پارەکەت و لە دڵت

برسیەک تێربکە،یارمەتی دودڵێک بدە،کەوتوویەک هەستێنەوە سەر پێ،قەرزی کەسێک بدەوە،

خێر کردن تەنها پارە نییە

چاککردنەوەی دڵێکی شکاو خێرە

سڕینی فرمێسکی کەسێک خێرە

دڵدانەوەی کەسێک خێرە

و هیچ شتێکیش نییە وەکو بێ فەرمانی خودا خەم هێنەر بێت

و هیچ شتێک ئارامی بەدڵ نادات وەکو خوا پەرستی

ئەگەر دڵتەنگ بووی ،دڵت سەرقاڵ بوو

لێپرسینەوە لەخۆت بکە لەسەر خودا پەرستیەکانت.

{فأَسَرَها يُوسُفُ في نَفْسِهِ وَلَم يُبْدِها لَهُم}

«یوسف ئەم شتانەی لە دڵی خۆی شاردەوە و دەری نەبڕی ،و خەفەتی خوارد لەسەر قسەیان»

ڕاستە ناخۆشیەکان ،دڵەکان ڕزگار ئەکەن،برینەکان پاک ئەکەنەوە

برینیش کە پاک بکرێتەوە زووتر چاک ئەبێتەوە

بەڵام هەموو دۆخێک کاتی ناخۆشی نیە

هەندێک کات ئەبێ وا خۆت دەرخەی کە لە هیچ تێنەگەشتووی لەکاتێکدا هەموو شت باش ئەزانیت

وا خۆت دەرخەیت کە هیچت نەبینیوە لەکاتێکدا هەمووشتت بینی

کەسە باشەکان ئەزانن:بەدەسهێنانی خەڵکی باشترە لە بەدەسهێنانی هەڵەکان

یوسف تەنها لەبەر ئەوە لە دڵی خۆی هێشتیەوە چونکە چاوپۆشی کاری کەسە بەخشندەکانە

{فَلا يُحزُنكَ قَولُهُمْ}

« با قسەکانیان خەمبارت نەکات»

خەڵکی هەندێک شتت پێ ئەڵێن کە لە تۆیا نییە،ئاوڕ مەدەوە بۆیان

بە پێغەمبەریان ئەوت جادوگەر، شێت،درۆزن،

بە یوسفیان وت دز

بە مریەمی پاکیان وت زیناکار

ئەم ڕاستیە لەپێش چاوت دابنێ

هەرچەن چاک بیت ڕزگارت نابێ لە دەمی خەڵک

موسا بە خودای وت:

خودایە ئەمەوێ خەڵکی تەنها بە باش باسم بکەن

پەروەردگار فەرمووی:

ئەی موسا من ئەوەم بۆ خۆم نەکردووە

خەڵکی لەسەر خودا ئەیانوت هاوسەر و منداڵی هەیە

ئەتەوێ قسە لەسەر تۆ نەکەن؟

{قُل هُو مِن عِندِ أنفُسِكُم}

«ئەی محمد(صلي الله عليه وسلم)پێیان بفەرموو ئەم تێکشکانە بەهۆی خۆتانەوە بوو لەبەر ئەوەی تیرهاوێژەکان سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەریان کرد.»

ئەگەر خەم و خەفەت بەسەرتدا هاتن بەخۆتدا بچۆرەوە

لەوانەیە خودا بەڵات بەسەر بێنێ بۆ چاک کردنەوەی شتێک کە تەنها بە بەڵا چاک ئەکرێتەوە

ئەوترێ:لەسەردەمی سولەیمان ئاسمان بارانی ناباراند ، ئەویش بە خەڵکی وت با دەربچین و بچین نوێژ بکەین

لەڕێگا مێرولەیەکی بینی دەستەکانی بەرز کردبۆوە و ئەیوت:خودایە خۆت ئەزانی توشبوون بە بەڵا لە تاوانەوەیە

و تەنهاش بە داوای لێخۆش بوون ئەڕوات

و ئێمەش یەکێکین لە دروستکراوەکانت

بەندەیەکین لە بەندەکانت

بەهۆی تاوانی مرۆڤەکان ئێمە ماندوو مەکە

سولەیمانیش بە خەڵکەکەی فەرموو

بگەڕێنەوە ماڵەوە خودا دوعای ئەو مێرولەیەی قبوڵ کرد.

{رَّبَكُم أَعلَمُ بِما في نُفُسِكُم}

«پەروەردگارتان زاناترە چی لە نەفسی ئێوەدایە»

ئەگەر شتێکت لەسەر وترا کە لە تۆدا نیە

ئەگەر بەهەڵە لە نیازت تێگەشتن

ئەگەر بریندار کرای بە قسەکانیان

هەموو ئەمانە ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن کاتێک خودا ئەزانێت چی لە دڵت هەیە

و ئەگەر هەمووکەس بە باشە ناوی بردی وپشتان گرتی و بەپیاو چاک ناویان بردی و جلی پیاو چاکانیان لەبەر کردی

هەموو ئەمانە سودت پێ ناگەیەنن کاتێک خودا ئەزانێت چی کە دڵتدا هەیە

بیرت بێت خودا سەیری ڕوخسارمان ناکا

بەڵکو سەیری دڵەکانمان ئەکات

{إِنما أشكو بَثِّي وَ حُزني إِلىٰ الله }

«گلەیی و گازندە و سکاڵام تەنها بۆلای خودا ئەبەم»

گلەیی کردن لە خەڵک بەزەییت بۆ ئەهێنێ

گلەیی کردن لای خودا ڕەحمەتت بۆ ئەهێنێ

کەسی لاواز گلەیی خۆی بۆ کەسێکی لاوازی وەک خۆی نابات، و هەموو کەسیش لاوازە

هەژار گلەی خۆی بۆ لای هەژار نابات و هەموو خەڵکی هەژارن

لاواز هانا بۆ بەهێز ئەبات،کەسیش لە خودا بەهێزتر نیە

هەژار هانا بۆ دەوڵەمەند ئەبات، و کەسیش لە خودا دەڵەمەند تر نیە

لەبەردەم خودایە بەتەواوی لاوازیت دەربخە

بگری،گلەیی بکە،بپاڕێوە

بەڵام لای خەڵک سەرت بەرز بکەوە و دەست بە برینەکەتەوە بگرە

چاوی بەزەی خەڵکی دڵ شکێنە

و خۆ دان بەسەر شانە کەسانی تر جۆرێکی تری شەل بوونە.

{فاذكُرُوني أذكُركُم}

«یادم بکەن یادتان ئەکەم»

نازانین بە کامیان دڵخۆش بین

یادم بکەن

یان

یادتان ئەکەم

خودای گەورە کاتێک سەیرێچی ئەکەیت تەنها شکستی خۆتە

و کاتێک گوێڕایەڵیت بەر ڕەحمەتی ئەکەوی

ئەمەش جوانترین بەشی خودا پەرستییە

کاتێک ئەزانیت بەر ڕەحمەتی خودا ئەکەوی

سەیری دڵی کردی،دڵێکی باشت هەبوو ئەویش خودا پەرستی بۆ ئاسان کردی

جا ئەمە چی پلە بەرزکردنەوەیەکە

دواتریش خودا خۆی یادت ئەکات

لە نیگای دڵت وردبەوە،تۆ بە زمانت و بە پەنجەکانت یادی خودا ئەکەی

و پاشای پاشاکان خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی یادت ئەکات

ئەگەر پێت بوترێ سەرۆکێک یان پاشایەک باسی کردووی ئەفڕی لە خۆشیا

لەوانەیە ئەو شەوە خەوت لێ نەکەوێ

ئەی چی ئەگەر پەروەردگار یادت بکات؟

{وَ لا تيأسوا مِن رَّوح الله إنهُ ييأس مِن روح الله إِلا القومُ الكافِرونَ}

«بێ ئومێد مەبن لە ڕەحمەتی خودا، بەدڵنیایەوە هیچ کەسێک بێ ئومێد نابێت لە ڕەحمەتی خودا تەنها کەسانی بێباوەڕ و کافر نەبێ»

ئەوتری :باشترین خوداپەرستی چاوەڕێکردنی خۆشییە

کاتێک هەموو ئەوانەی نزیکت واو لێ ئەکەن هەست بکەی هیچ دەربازبونێک نییە

بەڵام تۆ بڕوای تەواوت هەیە کە هەموو شتێک لە دەستی خودایە

بێ ئومێد مەبن،یەعقوب لەکاتی خۆشیدا ئەم قسەیەی نەکرد بەڵکو کاتێک بنیامینی لەدەست لەدوای لەدەستدانی یوسف

دواتر تەنها چەند ڕۆژێک بوو بۆنی یوسفی بۆهات

چەند ڕۆژێک دوای ئەوە بوو یوسفی نایە سنگی خۆیەوە

هەمووکات متمانەت بە خودا هەبێ

{لا يَضِلُ رَبي وَلا يَنسى}

«خوای گەورە لێی تێکناچێت و هەڵە ناکات و لەیادی ناکات»

خودا ئەو دڵانە لەبیر ناکات کە چاکت کردەوە

و ئەو فرمێسکانەی سڕیت

و ئەو دڵتەنگیەی لاتبرد لەسەر کەسانی تر

خودا ئەو کاتانە لەبیر ناکات کە بە چاوی پڕ فرمێسک ئەپاڕایتەوە و دڵنیابووی خودا وەڵامت ئەداتەوە

لەبیری ناکات کە ئەتوانی ئەو خراپەی بەسەریان هێنای بەسەریان بهێنیتەوە بەڵام بێدەنگیت هەڵبژارد

ئارامگریەکەت لەبیرناکات لەکاتی بەڵا و ناخۆشیەکان

و سوپاسگوزاریەکانت لەکاتی دڵخۆشی

خۆت بەچاوی خۆت ئەبینی خودا لە ئەنجامی ئەمانە چۆن پاداشتت ئەکات.

و ئەگەر خەڵکیش نرخی تۆ نەزانن

ئەوەت بەسە کە خودا ئەیزانێت

بێ هیوا مەبە

{قَليلاً مَّا تشكُرُون}

«کەمێک لە ئێوە هەیە شوکرانە بژێری نیعمەتەکانی خودا بێت»

خودا هێندە نیعمەتی بەسەرماندا دا کە وامانزانی مافی خۆمانە چیمان بوێ ئەیکڕین ، و لەبیری ئەکەین کێ پارەی بۆ ناردووین

دێین و ئەچین بە بەهێزی،و لەبیر ئەکەین کێ تەندروستیەکی باشی پێداوین

بە تەنیشت نەخۆشخانەکان ئەڕۆین و لەبیر ئەکەین کێ سەلامەتی پێ داوین

بە تەنیشت بەندیخانەکان ئەڕۆین و لەبیر ئەکەین کێ ئازادی پێ داوین

لە تەلەڤزیۆن مردن و داڕوخان ئەبینین و لەبیری ئەکەین کێ پاراستومانی

خراپترین نەخۆشی کە توشی مرۆڤ ببێت ئەوەیە هێندە نیعمەتی هەبێ کە ئیتر بە نیعمەتی نەزانێ

ئەو ماڵەی کە هەتە نیعمەتە،سەیری ئەوانە بکە کە لەسەر شەقام ئەژین

ئەو هاوسەرەی هەتە نیعمەتە ،سەیری ئەوانە بکە کە زەواجیان نەکردووە

ئەو منداڵەی بەرەو ڕووت ڕائەکات نیعمەتە

سەیری ئەوانە بکە کە منداڵیان نابێ

نوقم بووين لە نیعمەتەکانی خودا

بەڵام کەمتەرخەمین لە سوپاسکردنی

بۆیە هەمووکات بڵێ سوپاس بۆ تۆ خودای،تەنها بە سوپاسگوزاری نیعمەتەکان بەردەوام ئەبن.

{إِنَّ الحَسَناتِ يُذهِبنَ السيئاتِ }

«چاكەكان خراپەكان ئەسڕێتەوە و نایهێڵێت}

یاساكە زۆر سادەیە

ئەگەر نەتتوانی تاوان لەخۆت بكەیتەوە

بە چاكە دەوری بگرە

ئەگەر سەیری شتێكت كرد كە نابێ سەیری بكەی

دەستنوێژ بگرە و نوێژ بكە

ئەگەر كەسێكت فریودا،خێر بكە

ئەگەر شەیتان یەكجار تۆی بەزاند

هەزاران جۆری خودا پەرستی هەیە كە هەقی بكەیتەوە

ناڵە و هاواری تۆبەكاران خۆشەویستترە لای خودا لە خودا پەرستی پیاوچاكان

پیاوچاك لەوەیە شەیتان تەواو وازی لێ هێنابێت

بەڵام ئەوەی تاوان ئەكا هێشتا هێشتا لە جەنگدان

تاوان ئەیشكێنێ و خۆی دروست ئەكاتەوە بە خوداپەرستی

پێی هەڵئەكەوێ لە تاوان ،بەڵام هەر خودا پەرستی ئەكات

ئەگەر تۆ تاوان ئەكەیت و ئەتشكێنێ

و بە خەجاڵەتیەوە ئەچیتەوە بەردەم خودا

{فَسَقىٰ لَهُما ثُمَّ تَوَلَّىٰ إِلَى الظِّلِّ}

«موسا ئاوی بۆ دوو کچەکە دەرکرد و دواتر چووە سێبەری دارێک دانیشت»

چاوەڕێی دەستخۆشی مەکە بۆ هەموو چاکەیەک کە ئەیکەی

و چاوەڕێی چەپڵە لێدانی خەڵک مەبە

بە دڵێکی سپیەوە بژی

ئەوەی پێویستی بە یارمەتی بوو یارمەتی بدە

هەرکەس پێویستی بە دڵ دانەوە بوو دڵی بدەوە

کەوتوویەک هەستێنەوە،لاوازێک سەربخە

وا بکە کاری خێر وەکو هەناسەدان ئاسایی بێت لات

ئەگەر خێری کرد یەکسەر چاو لابە

با شکانی ئەو هەژارە نەبینی

پێغەمبەر موسا چەند مەرد بوو کە یارمەتیانی دا و ڕۆشت

خوداش پاداشتی کرد بە شتانێک کە لە وشەی سوپاس جوانتر بوو

هەمووکات بیرت بێت تۆ مامەڵە لەگەڵ پەروەردگاری میهرەبان ئەکەی

{قال لاَ تَثرِب عَلَيكُم اليوم يَغفِرُ اللهُ لَكُم}

«پێغەمبەر یوسف فەرموو:ئەمڕۆ هیچ سەرزەنشت و لۆمە ناکرێن بەڵکو لێتان ئەبورم ،خوای گەورە لێتان خۆش بێت»

پلانی کوشتنیان بۆ دانا

دواتر کردیان بە دوو خراپە

خستیانە بیرەکەوە دواتریش فرۆشرا وەک ئەوەی بەردەیەک لە بازاڕدا ئەفرۆشرێ

و کاتێک بە داوای لێبوردنەوە هاتنەوە لای بەپەلە لاپەڕەیەکی نوێی هەڵدایەوە

پیاوچاکان بەم شێوەیەن،باسی ڕابردوو ناکەن

مەسعودی هەمەزانی زۆر لە خەڵک ئەبوری

کاتێک یەکێک بهاتایە داوای لێبوردنی لێ بکا

ئەیوت:ڕابردوو باس ناکرێ

کاتێک مرد کەسێک لە خەویدا بینی

لێیان پرسی خودا چۆن بوو لەگەڵت؟

مەسعود وتی:لەنێوان دەستەکانی ڕای وەستاندم و وتی ئەی مەسعود ڕابردوو باس ناکرێ ،بچۆ بەهەشت.

{وَلا تَنسوا الفَضُلَ بَينَكُم}

«ئەو فەزڵ و چاکەیەی لەنێوانتاندا هەبووە لەبیری مەکەن»

مشتومڕت لەگەڵ ناکەم

من ناتوانم شمشێر بەسەر کەسێک بەرزبکەمەوە کە خۆشمویستووە

دابڕان لێی ئاسان نابێ بۆم،چاکەکانی نێوانمان لەبیر ناکام

کاتێک شتەکان گەشتن بە ڕێگایەکی داخراو

شتێک لە متمانە و ڕێزگرتن کەم بۆوە

دەستنوێژێک ئەگرم و نوێژ ئەکەم و ئەڵێم

خودایە دەست بەسەر دڵی منیش و دڵی ئەویش بهێنە و بۆ هەریەکەمان کەسانی باشتر بهێنە ژیانمان

دواتر ئەڕۆم

{قال أخَرَقتها لِتُغرِق أهلها لَقَد جئت شيئًا إِمَراً}

«موسا وتی ئایا کەشتیەکەت کون کرد بۆ ئەوەی خەڵکی ناو کەشتەیەکە نوقم بکەی بەڕاستی کارێکی خراپت کرد»

حەزرەتی خزر تاکا پاڵەوانی چیرۆکەکە نیە

موساش پاڵەوان بوو

کاتێک بەخزری وت نابێ کوشتیەکە کون بکەی

چونکە بە شتێکی باش نایەتە بەرچاو

کاتێک وتی نابێ پیاوەکە بکوژیت

چونکە تاوانە

مرۆڤێک بوو خاوەن بناخەیەکی ڕێک و ڕاست بوو

بێدەنگ نابێ لەسەر تاوان

و لەگەل خزر ناگونجێ هەرچەنە ئەو ڕێگایەی بڕی تاکو لەو فێر بێت.

خودایە دڵنیایەکی وەکو موسامان پێ بدەی

کاتێک دەریای لە پێش خۆی بینی

و فیرعەونیش لە دوای بوو

قەومەکەی وتیان{إِنَّا لَمُدْرَكونَ}

«ئەوە فیرعەون پێمان گەشت»

موسا وتی:

{كَلَّا إِن معي رَبي سَيَهديني}

«نەخێر،من خودام لەگەڵە ڕێگام نیشان ئەدات»

و دڵنیایەک وەکو دڵنیای پێغەمبەر(صلي الله عليه وسلم)

کاتێک ئەبوبەکرد وتی

ئەگەر یەکێک سەیری لای قاچەکانمان بلات ئەمانبینێ

پێغەمبەر فەرمووی

ئەی ئەبو بەکر خەمی دوو کەستە کە سێیەمیان خودایە.

{وَ فُؤادُ أُم مُوسىٰ فارِغاً إِن كادَت لِتُبدِي بهِ لَولا أن رَّبطنا عَلَىٰ قَلبِها}

«دوای ئەوەی موسا ئاوەکە بردی دایکی موسا دڵی بەتاڵ و خاڵی بوو هیچ شتێکی تیا نەبوو لە کار و باری دونیا،لە سەختی و غەم و پەژارەدا خەریک بوو ئاشکرای بکات بڵێ ئەوە کوڕی منە،ئەگەر خودا دڵی دامەزراو و بەهێز نەکردایە »

خودایە شتێکی ئەوها بە ئێمەش ببەخشە

دڵمان دامەزراو بکە

وەک چۆن دڵی دایکی موسات دامەزراو کرد.

{قَد أوتيت سُؤلَكَ يا مُوسىٰ}

«.ئەوەی داوات کرد هەمووم پێ بەخشیت ئەی موسا »

خودایە ئاوها بە ئێمەش ببەخشە

بۆ ئاواتەکانمان،چاوەڕێکردنمان،دڵخۆشیمان

کاتێک لە خەڵکی دور کەوتەوە و تۆ فێرت کرد.

{تَوَفَني مُسلِماً وَألحِقني بِالصالحين}

«به موسڵمانی بممرێنه و بمگەیەنە بە پیاو چاکان لە پێغەمبەران»

خودایە شاراوەییەک نە بۆ ئێمە و نە لەسەر ئێمە

ئازاری کەس نەدەین کەس ئازارمان نەدا

کەس بریندار نەکەین و بریندار نەکرێین

سوکایەتی بە کەس نەکەین و سوکایەتیمان پێ نەکرێ

خودا تێپەڕبوونێکی ئاسان

نە چاومان لە دەستی کەس بێت

و نە کەس چاوی لە دەستی ئێمە بێت

{يُدَبِر الأمر }

«خودا کار و بارەکان بەڕێوە ئەبات»

لێرەدا دڵ ئارام ئەبێتەوە

و ژیان ئاسان ئەبێ

جا کێ هەیە وەکو خودا کار و بار بەڕێوە ببات

{فَأَدادَ رَبَكَ أَن يَبلُغَا أَشَدَهُما وَيَستَخرِجا كَنزَهُما}

«بەهۆی چاکەی باوکیانەوە خودا ویستی تا منالّەکان بالغ ئەبن و پێی ئەگەن ئەوکات گەنجینەکەیان دەرکەن »

متمانەت بە خودا هەبێ

لە دواکەوتنی شتەکان

تەنانەت ئەگەر بەدەستیشی نەهێنی

لەوەشدا نیعمەت هەیە

تەنانەت ئەگەر نەشیزانین

لەگەڵ کاتدا ئەزانیت کە خودا بەم شێوەیە خێرێکی زیاتری بۆت داناوە وەک لەوەی بۆ خۆتت ئەویست

{إِني أخاف الله}

«من له خودا  ئەترسم»

جوانترین داوای لێ بوردن لەسەر شەڕکردن له مێژوودا قابیل به هابیلی وت

مەهێڵه ئەوانه وات لێ بکەن له ئاینەکەت بێیته خوارەوە ئەگەر ژیانت لەپێناوی داناوه

بەڵێ مرۆڤ بێ ئاین ئەژی

بەڵام قەت بیرت کردۆتەوه که چۆن ئەژی

بەدوای زۆرترین ڕادەی خۆشی ئەگەڕێ

زۆرترین ماوه بۆ مانەوه

بەڵام کۆتای ڕێڕەوەکه هەر مردنه

بنچینەی چوار خراپەکە

{يا أبتِ استأجِرهُ إِنَّ خَيرَ مَنِ استأجرت القَوِيُ الأمين}

«ئەی باوکە بەکرێی بگرە تا شوانیمان بۆ بکا بەڕاستی باشترین کەسە تا بەکرێی بگرین چونکە زۆر بەهێز و ئەمینی»

١.التَعالی

{أنا خيرٌ مِنهُ}

«من لەو باشترم»

ئیبلیس ئەمەی وت

٢.الاستكبار

{مَن أشَدُ مِنا قُوةٌ}

«کێ لە ئێمە بەهێزترە»

عاد ئەمەی وت

٣.الاستبداد

{ما أرِيكُم إِلا مَا أَرَىٰ}

«هیچ شتێکتان پێ نالێم تەنها ئەوەی خۆم ئەیبینم»

فیرعەون وتی

٤.غرور

{إنما أوتيتهُ عَلَىٰ عِلمٍ عِندي}

«ئەم ماڵەم بە لێهاتووی خۆم پەیدا کردووە»

قارون ئەمەی وت

فلما جاءهُـ وَقَص عَليهِ القِصص قال لا تَخَف}

«کاتێک موسی چووه لای باوکی کچەکان و چیرۆکی میسری بۆ گێڕایەوه پێی وت مەترسە»

جوانترین شت کە پێشکەشی کەسێکی بکەی ئەوەیە کە دڵی بدەیتەوه

سوڕەتی کهف:

ئەو کەشتیەی کە ئەگەر کون نەکرایە داگیر ئەکرا

خودا بەڵایەکی بچوکت بەسەر دێنێ تا بەڵایەکی گەورەت لێ دوربخاتەوه

ئەو کەسەی ئەگەر نەکوژرایە دایک و باوکی ماندوو ئەکرد

کاتێک خودا شتێکت لێ ئەستێنێ دڵنیابە شتێکی ترت پێ ئەبەخشێ

ئەو دیوارەی ئەگەر چاک نەکرایە ماڵی دوو هەتیوەکە ئەخورا

ئەمە چی دڵسۆزیەکە خودایە؟

هەر بۆیە لەگەڵ هەر کونێک

هەر لەدەستدانێک

و هەر نیعمەتێک

بڵێ خودایە ئارامیمان پێ ببەخشە لەسەر ئەوەی خۆمان خێرەکەی نازانین.

{يُرِيدُونَ لِيُطَفِؤوا نُور الله بِأفواهِهِم وَاللهُ مُتِمٌ نُورهُ وَلَو كَرِهَ الكافِرون}

«ئەیانەوێ بە فووی دەمیان نور و ڕوناکی خوای گەورە بکوژێننەوە کە دینەکەی خودا گەورەیە،خودای گەورە نور و دینەکەی خۆی ئەگەیەنێت و بڵاوی ئەکاتەوە لە هەموو شوێنێک با کافرانیش پێیان ناخۆش بێت.»

نە قورئان تێک ئەدرێ

نە حیجاب لا ئەبرێ

نە بانگدان نامێنێ

نە جیهاد ئەوەستێ

کاروانی ئیسلام هەر بەڕێوەیە

ئەوەی لەگەڵیان بێت ئەگات

ئەوەی لێی دوا بکەوێت بزر ئەبێ

کەسانی نزیک وتیان{اقتُلُهُ یوسُف}

«یوسف بکوژن»

بێگانەیەکیش وتی{أکرِمي مَتواهُ}

«ڕێزی لێ بگرە»

خۆشەویستی ڕسقە

تۆش نازانی ڕسقت ئەکەوێتە کام دڵەوە.

{أَحَطَتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ}

«ئەی سولەیمان من زانیارییەک ئەزانم کە تۆ نایزانی و من لە سەبەئەوە هەواڵێکی دڵنیاکارم بۆت هێناوە »

کاتێک هودهود ئەوی ئەزانی کە پێغەمبەر نایزانی

ئەمە وانەیەکی باشە بۆت:

خۆت بە کەم بزانە

ئەوەی لە زانست نایزانین زۆر زیاترە لەوەی لەسەری ئەیزانین

وەکو ئەبو نەواس وتویەتی

ئەوەی زۆر باسی زانستی خۆی بکات ئەوە نازانێت

شتێک ئەزانیت زۆر شتی تر هەیە نایزانیت.

{فَلَما ذَهَبوا بِهِ وَأجمَعوا أن يَجعَلوهُ في غَيابَتِ الجُبِّ}

«کاتێک باوکی ڕازی بوو لەگەڵ خۆیاندا بردیان وە خۆیان یەکلا کردەوە و بۆچونیان کۆکردەوە کە بیخەنە قوڵای بیرەکەوە »

ئەو منداڵەی خرایە بیرەکەوە

بە سەتڵەکە بەرز کرایەوە

و بە نرخێکی هەرزان فرۆشت

لەسەخۆ ئامادە ئەکرا بۆ ئەوەی ببێتە عەزیزی میسر

لاپەڕەیەکی سەخت لە کتێبی ژیانت

لەوانەیە تەنها ئاسانکاری بێت بۆ جوانترین پەڕەکانی ژیانت ،گومانی باش بە خودا ببە.

{فَإِمساكٌ بِمَعروفٍ أَو تَسريحٌ بإِحسانٍ}

«ئەگەر تەڵاقەکە ڕەجعی بوو یان ئەوەتا خێزانەکەی خۆی بهێنێتەوە بەڵام بە چاکە و هەق و مافی بدات یان یەکجار وازی لێ بێنێت بەڵام بە چاکە»

کۆتای پەیوەندییەکان خەمبارم ناکات

ژیان خۆ هەر کۆتای دێت ڕۆژێک

بەڵام شێوازی کۆتایی هێنانی خەمبارم ئەکات

حەز ئەکەم لە هەموو پەیوەندیەکانم بە باوەش کۆتایی بێت

وەک بڵێی ماڵئاوای لە ئازیزێکم ئەکەم لە فڕۆکەخانە

نەک بە بریندار لێی دەربچم

وەک ئەوەی لە شەڕەوە هاتبم.

{وَتواصوا بِلحَقِ وَتَواصوا بِالصَّبرِ}

«ئامۆژگاری یەکتر بکەن بە حەق و ئامۆژگاری یەکتر بکەن بە ئارامگرتن»

کاتێک ئامۆژگاریم کردی

پێت ناڵێم من باشترم لە تۆ

بەڵکو پێت ئەڵێم من باشترم بۆت ئەوێ

{يَومَ نَحشُرُ المُتَقينَ إلَىٰ الرَحمٰن وَفَّداً}

«لەڕۆژی قیامەت ئەوەی کە تەقوای خوای گەورەی کردووە کۆیان ئەکەینەوە و بەرەو لای خوای گەورە دێن بۆ بەهەشتەکەی خودا بەڕێ ئەخرێن»

کێشە نییە ئەگەر کاروانێکت لەدەست چوو

کە بۆ لای پاشا ئەچێت

گرنگ ئەوەیە ئەو کاروانەت لەدەست نەچێت کە بەرەو پاشای مردنت ئەبا

{وَ أَوحَيناَ إِلَى أُم مُوسى أن أرضِعيهِ فإذا خِفتِ عَلَيه فألقِيه في اليم ولا تخافي وَلا تَحزني إِنَّا رَآدُوهُ إليكِ وَجاعِلوهُ مِن المُرسلين}

«ئیلهاممان به دایکی موسا دا و خستمانه دڵیەوه که دوگیان بوو ،کاتێک لەدایک بوو شیری پێ بده،ئەگەر لەسەربازانی فیرعەون ترسای بیخه ناو دەریای نیلەوه و مەترسه و دڵتەنگ مەبه ئەیگەڕێنینەوه بۆت و ئەیکەین به یەکێک له نێردراوان»

ئەی خودا:

ئەو دڵنیایەی له دڵی دایکی موسا دات نا

کاتێک موسای خسته دەریاوه

دڵنیا بوو که بۆی ئەگەڕێنیتەوه

ئەو دڵنیایه بخه دڵی منیشەوه.

مرۆڤ هەرچەند باش و چاکەکار بێت

کەسێل هەر ئەبێت کە ڕقی لێی بێت

تەنانەت پێغەمبەرانیش هەموو کەس خۆشی نەویستن

{إِنَّ هؤلاء لشرذمة قليلون }

«بەدڵنیایەوە ئەمانە کەسانێکی نزم و بێڕێز وکەمن»

فیرعەون ئەمانەی لەسەر موسا و هاوەڵانی وت

فیرعەونەکان بەم شێوەیە بوون هەموکات

بە ژمارەی شوێنکەوتووکانیان فریو ئەخۆن

{وَ تِلك الأيام نُداوِلُها بَين الناس }

«ئەم ڕۆژانە لە سەرکەوتن و تێکشکان خودا دابەشی کردووە بەسەر خەڵکدا»

کێ ئەیزانی کە موسایەک کە کاری شوانی ئەکرد چەندینساڵ

دواتر قسە لەگەڵ خودا ئەکات ؟

و محمد (صلی الله علی وسلم)

کە شوانی بۆ قورەیشەکان ئەکرد

بە کرێیەکی کەم

دواتر ئەبێت بە کۆتا پێغەمبەر و کۆتا پەیامبەر؟

لەوانەیە جوانترین ڕۆژەکانی ژیانت هێشتا نەهاتبن

کەمێک هەوڵدان

و گومانێکی باش بە خودا

ئەوکات ئەبینی شتانی جوانتر دێت

باشترین نیعمەت کە خودا پێتی ببەخشێ ئەوەیە لای دروستکەر خۆشەویست بیت

خودا بە موسای وت:

{وَألقيتُ عَلَيك مَحَبةً مِنَّي}

«خۆشەویستی خۆمم بەسەردا ڕژاندی»

ئیبن کەسیر ئەڵێت

هیچ کەس نییە موسای نەبینیبێ ئیللا خۆشیویستووە

ئیبن مەکندەر بە ئەبی حازمی وت:

خەڵکی ئەمبینن و دوعای خێرم بۆ ئەکەن

نە ئەیانناسم و نە خێرم بۆیان هەبووە

ئەبوحازم وتی:ئەوە ڕەحمەتی خودایە

{سَيَجعَلُ لَهُم الرَّحمٰن وُدًا}

«خودای گەورە خۆشی ئەوێن دواتر ئەهلی ئاسمان خۆشی ئەوێن پاشان خەڵکی زەویش خۆشی ئەوێن»

ئەوەی دونیا تەنگی پێ هەڵچنیوە

پێی بڵێ با دوعاکەی یونس بکات

(لا إله إِلا أنت سُبحانَكَ إني كُنت مِن الضالمين)

{قالَ إنَما أشكو بَثي وَ حُزني إِلىٰ الله}
«گلەیی و گازندەو سکاڵام تەنها بۆ لای خودا ئەبەم»

یەعقوب ئەمەی وت
کاتێک کوڕەکەی لەدەست دا
و چاوەکانی لەدەست دا
خوداش هەم کوڕەکەی و هەم چاوەکانی بۆ گەڕاندەوە
ئەوەی ویستی دڵی هەڵڕێژێ
با ڕوو لە خودا بکات

خودایە وام لێ بکە وەکو نوح گوێڕایەڵی فەرمانەکانت بم

کاتێک پێت وت:

{أن اصنع الفلك }

«کەشتیەک دروست بکە»

دروستی کرد بێ ئەوەی بڵێ ئاخر خودایە کەشتی چی کاری هەیە لە بیابان؟

جوانترین نوسراو لە نوسراوەکانی ئیمامی قوشەیری لەسەر پێغەمبەر سولەیمان و هودهود :

{لأعذبته عذاباً شديداً}

« بەدڵنیایەوە ئەبێ سزایەکی زۆر سەختی بدەم»

وتی سزایەکی سەخت

سزاکەش جیاکردنەوەی بوو لە ئازیزێک

چونکە جیابونەوە و دابڕان لە ئازیزێک وا لە مرۆڤ ئەکات هەست بکات لە کاتی هەناسە دان دەرزیەک لە قورگیەتی

لە ڕۆژی عاشورا موسا گەشتە لای ئاوەکە

هیچ ڕێگەیەکی دەربازبوون نەبوو

دەریاکە لەپێشێتی

فیرعەونیش لە دوایەتی

بەنو ئیسرائیلیش ئەڵێن:

«تیاچوون فیرعەون پێمان گەیشت»

بەڵام موسا بە دڵنیایەوە وەڵامی دانەوە و وتی

نەخێر خودام لەگەڵە ڕێگەم نیشان ئەدا

خودایە دڵنیایەکی وەکو موسامان پێببەخشە

و دڵسۆزیەک لەسەر بەڵێن وەکو موسا

و متمانەیەک بە تۆ وەکو متمانەی موسا

{إني أخافُ أن يَمَسَكَ عَذابٌ مِن الرحمٰن}

«من ئەترسم لەلای خودای میهرەبانەوە سزایەک بەسەردا بێت»

جوانترین شێوازی خۆشەویستی خۆشەویستیەکە هانت بدات بۆ خودا پەرستی

ئەوەی ڕۆژی قیامەتتی لا گرنگ نەبێ ئەوە تۆی لا گرنگ نییە

ئەگەر هاوڕێیەکت لە لێواری تاوان بینی و ئامۆژگاریت نەکرد ئەوە خۆشەویستیەکەی تۆ شتێکی کەمە

ئەترسی هەستی بریندار بکەی ،بەڵام ناترسی تووشی دۆزەخ بێت؟

دەستی ئازیزانت بگرە بۆ بەهەشت

هەرکەست بینی خەریکی خودا پەرستیە زیاتر هانی بدە

هەرکەسیشت بینی لەسەر تاوان بیگەڕێنەوە بۆ خودا تەنانەت ئەگەر بە مل ڕاتکێشتووە

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە هاوڕێکەی وت:

ئەگەر منت بینی ڕێگام ون کردووە

چمکێکی جلەکەم بگرە و زۆر بە توندی بمهەژێنە

و پێم بڵێ عومەر لە خودا بترسە ڕۆژێک دێت ئەمریت

{فَفِرَّوا إِلىٰ اللهِ}

«بەڕاکردن بگەڕێنەوە لای خودا»

هەموو ڕاکردنێک ترسنۆکیت ئەسەلمێنێت

تەنها ڕاکردنت بۆلای خودا ئازایەتیت ئەسەلمێنێ

ڕاکردن بۆ خودا ڕاکردنی سەرکەوتنە نەک شکست

و بڕیاری کەسی بەهێزە نەک کەسی لاواز

هەندێک جۆری دیکەی پاڵەوانی هەیە:

نەکردنی تاوانێک کە ئەتوانی بیکەی،پاڵەوانێتیە

بە شکاوەی بچیتەوە بەردەرگای خودا دوای هەموو تاوانێک ،پاڵەوانیە

هەستان لە جێگاکەت بۆ کردنی نوێژی بەیانی پاڵەوانییە

پاڵەوانی نیشاندانی ماسولکەکان نییە

عەبدوڵای کوڕی مەسعود ڕۆژێک چووە سەر دارێک

هاوڕێکانی  پێی پێکەنین چونکە قاچەکانی زۆر لاواز بوون

پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم)فەرمووی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە

لەسەر تەرازوو قورستا چیای ئوحودیان هەیە.

{وَلاكِن كَرِهَ اللهُ انبِعاثَهُم فَثَبَّطَهُم}

«بەڵکو خودای گەورە پێی ناخۆش بوو کە ئەوان لەگەڵ موسڵمانان دەرچن بۆ غەزا بۆیە دوایخستن و داینیشاندن»

کاتێک خودا بەکارت ئەهێنێ بۆ خزمەت کردنی ئاینەکەی

ئەوە بزانە خودا سەیری دڵی کردووی و لێی ڕازی بووە

مرۆڤ هەر مرۆڤە نایەوێ کەرەستەیەکی پیس بەکاربهێنێ لە کاروباریدا ئەی چی لەسەر خودا لەکاتێکدا ئەو خودایە؟

هەرکەس لەسەر ڕێگەی خودا نەبوو ئەوە بزانە خودا تەماشای دڵی کردووە

و دوریخستۆتەوە

حەسودی بە کەسە بەناوبانگەکان مەبە کەسەر شتی بێ مانا

ئەگەر خودا خۆشیبویستنایە لەڕێگەی پەیامەکەی بەکاری ئەهێنان

حەسودی بەوانە مەبە کە خاوەنی ملیاران دۆلارن ە کارێکی خێری لێ ناکەن

ئەگەر خودا خۆشی بویستنایە دەسی لێیان بەر نادا

{فَلا تَغُرَّكُم الحياةُ الدُنيا}

«به ژیانی دونیا فریوتان نەدا و لە خشتەتان بەرێ»

دونیا کورتە هەرچەن لەچاوی تۆدا دوور و درێژ بێتەوە

بە نوح وترا،بۆچی ماڵێکت دروست کردووە لە قامیش؟

ئەویش وتی :ئەمە ماڵی ڕۆشتوویەکە

زیاتر لە هەزار ساڵ ژیا ،ژیان بەلایەوە کورت بوو

پێغەمەر (صلى الله عليه وسلم)ئەیوت:من چیم هەیە لە دونیا

من لەم دونیایە وەکو ڕێبوارێکم کەمێک لەژێر سێبەری دارێک دائەنیشێ و دواتر جێی ئەهێڵێ

بچوکە هەر چەند لەچاوی تۆدا گەورە بێت

ئەگەر ئەم دونیایە نرخی باڵە مێشولەیەکی هەبوایە لای خودا

قومێک ئاوی لێی نادا بە کافرێک

نامێنێ هەرچەن وا هەست بکەی ئەمێنێتەوە

خەلیفە مەنسور بە رەبیعی وت:ژیان چەندە جوان ئەبوو بێ مردن

رەبیع وتی:ژیان تەنها بە مردن جوان ئەبێ

مەنسور وتی چۆن؟

رەبیع وتی ئەگەر مردن نەبوایە تۆ قەت نابووی بە خەلیفە.

{فَوَيلٌ للقاسية قُلُبُهُم مَّن ذِكرِ اللهِ}

«هەڕەشەی سەخت بۆ ئەو کەسە دڵڕەقانەی کە دڵیان ڕەقە لەئاست زیکر و یادی خودا»

کەسێکی سەرپێچیکار ئەبینی خۆی بە ئەدا بە هێزەوە و ئەڵێ بۆچی خودا سزای نەداوم؟

ئەی نەزان،چی سزایەک لەمەی ئێستات سەختترە؟

تەرمێک بە تەنیشتت ئەڕوات کەچی دەرس وەرناگری

گوێت لە ئایەتێک ئەبێت باسی مردن ئەکات و ترس داتناگرێ

کەسێکی هەژار ئەبینی دڵت بۆی نەرم نابێ

هێشتاش ئەبرسی کوا سزا؟

چی سزایەک سەختترە لەوەی دڵی مرۆڤ گۆڕستان بێت؟

ئیبن قەیم ئەیوت:هیچ بەندەیەک سزایەکی سەختتری بەسەردا نەدراوە لە دڵڕەقی خراپتر بێت

{وكأين مَن دابةٍ لا تَحمِلُ رِزقَها الله يَرزِقُها وَإياكُم}

«زۆرێک گیانلەبران هەن لەبەر لاوازیان ناتوانن ڕسقی خۆیان کۆبکەنەو و هەڵیبگرن بەڵام خودای گەورە ڕسق و ڕۆزی ئەوانیش و ئێوەش ئەدات»

سەیری زیندەوەرانی نزیکت بکە

باڵندە،ماسی،بۆق،مار،بەکتریا،و هەموو گیانەوەران

جلێکیان نییە کە گیرفانی هەبێت

هیچیان حیسابی بانکیان نیە

گرەنتی تەندروستیان نیە

موچەی بەساڵاچونیان نییە

بەیانیان هەڵئەسن و دڵنیان خودا ڕسقیان ئەدات

بۆیە هیچیان لە برسا نامرن

خۆت بدە دەست خوداوە

ئەوترێ پێغەمبەر سولەیمان بە مێرولەیەکی وت

چەن دەنک خواردن ئەخۆی لە ساڵێکدا؟

ئەویش وتی دوو

خستیە شوێنێکەوە لەگەڵ دوو دەنک خواردن

دوای ساڵێک هاتەوە بینی یەک دەنکی خواردووە

لێی پرسی کە بۆچی

مێرولەکە وتی کاتێک ئازاد بووم ڕسقم لەسەر خودا بوو

دڵنیابوم خودا لەبیرم ناکات

بەڵام کاتێک ڕسقم بە دەستی تۆ بوو ترسام لەبیرم بکەی

{رَبَنا لا تُزِع قلُبَنا بَعَد أَن هَدَيتنا}

«ئەی پەروەردگار دڵمان لە حەق لانەدەی دوای ئەوەی هیدایەتی دڵمانت دا بۆ حەق»

چی پاڕانەوەیەکە!

ئەوەی تامی نزیکی لەخودا بکات

ئەترسێ لە دووری خودا

بۆیە داوا داوا لە خودا ئەکەن

بێ بەشیان نەکات لە نزیک بوون لە خۆی

چەند کەس هەن لەخودا نزیک بوون دواتر دورکەوتنەوە

پێیان وابوو دوور و نزیکی بەدەستی خۆیانە

بۆیە خودا دەگای خۆی داخست بەڕویاندا

کەسی خوا پەرست زۆر زیاتر ئەترسێ لەوەی لەخوا پەرستی دووربێ

لەوەی کە تاوانبار لە تاوان ئەترسێ

{إن الذين يَخشَونَ رَبَهُم بِالغَيبِ لَهُم مَغفِرةٌ وَأجراً كَبيراً}

«ئەو کەسانەی لەخوای گەورە ئەترسن بەزانستەوە لەکاتی نهێنی و پەنهادا کە چاوی کەسیان لێوە دیار نییە لە ترسی خودا تاوان ناکەن و خۆیان ئەپارێزن ئەمانە لێخۆشبوونی خوای گەورەیان بۆ هەیە و خودا لێیان خۆش ئەبێت»

چاوی کەسیان لێ دیار نییە

بەڵام ئەزانن خودا چاودێرە بەسەریان

وازیان لە تاوان هێنا هەرچەند ئەیانتوانی بیکەن

حەز و ئارەزووی خۆیان بەند کرد

وازیان لە سەرپێچی هێنا هەرچەنە ئاسان بوو

وازیان لە ئارەزووی خۆیان نەهێنا چونکە ڕقیان لێی بوو

یان وازیان لە پارەی حەڕام نەهێنا چونکە حەزیان لە پارە نەبوو

بەڵکو وازیان لێ هێنا لەبەر خاتری خودا

ئەیاننزانی خودا ئاگادار و چاودێرە

ئەمە لەخودا ترسانە کاتێک کەس ناتبینێ

{قيل لَها ادخلي الصَّرحَ فَلَما رَأتهُ حَسِبَتهُ لُجةًوَكَشَفَت عَن ساقَيهَا}

«کاتێک ئافرەتی پاشای سەبەء موسڵمان ئەبێ پێغەمبەر سولایمان پێی وت وەرە ناو کۆشکەوە کە زەویەکەی شوشە بوو ژێری ئاو و ماسی تێدابوو بۆ ئەوەی توانا و دەسەڵاتی خوائ گەورە نیشانی ئەو ئافرەتە بدات

ئافرەتەکە وایزانی ئاوە و جلەکانی هەڵکرد تا تەڕ نبن»

بەڵقیس پێی وابوو کۆشکەکە تەنها شوشەیە و ئاوە بۆیە قاچەکانی هەڵکرد تا جلەکانت تەڕ نەبن

بەم ڕادەیە جلەکانی درێژ و داپۆشراو بوون

داپشراوی لەسەرەتای مێژووەوە جل و بەرگی شاژنەکان بووە

بەڵام خۆڕوتکردن و دەرخستنی جوانی بۆ هەوەسبازەکان بووە

سەیری جلەکانی خۆت بکە و خۆت بڕیار بدە

ئایا وەکو شاژنە بەڵقیسی یان وەکو ئەوانی تر؟؟

{وَرَبَطنا عَلَىٰ قُلُبِهُم }

«دڵیانمان بەهێز و جێگیر و ئارامگرمان کرد »

دڵەکان لەرێ لا ئەدەن،تەنهاش خودا جێگیری ئەکات

هەرچەنە ئیمان لەدڵت هەبوو هەرگیز مەوەستە لەداوا کردنی جێگیری

ئەمەش دوعای پێغەمبەرمان بوو زۆرکات

ئەی جێگیری دڵەکان،دڵم لەسەر دینەکەت جێگیر بکە

لەکاتێکدا ئەو پێغەمبەر بوو و باشترین دروستکراو بوو

ئەگەر خودا جێگیری نەبەخشایە بە دڵەکان

ئەوە شەیتان یاری پێ ئەکرد

یارانی ئەشکەوت لەسەر حەق بوون شارەکەیان هەمووی بتپەرست بوون

کاتێک خودا دڵیانی جێگیر و ئارام کرد

هەموو شت. ئاسان بوو لایان

و دایکی موسا پێش ئەوەی بیخاتە ئاوەکەوە

ئەگەر خودا دڵی ئارام و جێگر نەکردایە وای ناکرد

بۆیە هەموو کات داوا بکە خودا دڵت جێگر و سەقامگیر بکات

{وَوَجَدوا ما عَلَموا حاضِرا وَلا يَظلِمِ رَبُكَ أحَداً}

«ئەوەی لە دونیا کردویانە لە چاکە و لە خراپە ئەبینن
هەرهەمووی نوسراوەو جێگیر کراوە و پارێزراوە

و پەروەردگارت ستەم لە هیچ کەس ناکات »

ژیانت کتێبێکە کە لە ڕۆژی قیامەتدا لەلای خودا ئەیخوێنیتەوە

ئاگاداربە نوسەرێکی خراپ نەبیت

ئەمڕۆ شتانێک بنوسە کە سبەی شەرم نەکەی لە خوێندنەوەی

و لاستیکی داوای لێخۆشبونیشت هەیە کە ئەتوانی تاوانەکانتی پێ بسڕیتەوە

و پەڕەی سپی زۆرت هەیە بۆ ئەوەی دێڕی جوان بنوسی

با لاپەڕەکانت خێر بن

با چاکردنەوەی دڵی شکاو بن

و چەندین دێڕ شەونوێژ بن

تەنانت فاریزەیەکیش بە ڕۆژوو بۆت بنوسرێ

ڕاستە کەس بە هەوڵی خۆی ناچێتە بەهەشت

تەنانەت پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) بە ڕەحمەتی خودا ئەچێتە بەهەشت

بەڵام کاری چاکە ڕەحمەتت بۆ ئەهێنێ.

{وَهُزِي إلَيكَ بِجِذعِ النَخلة}

«ئەو قەدی دارخورمایە ڕابوەشێنە»

خودای گەورە ئەزانێت پیاوێک هەرچەند بەهێز بێت ناتوانێ دارخورمایەک ڕابوەشێنێ

ئەی چی لەسەر ئافرەتێک کە تازا منداڵی بووە

بەڵام کاتێک خودا بە دارەکە بڵێ بهەژێ ...

تەنها ویستی هۆکارەکان بزانین

و تا فێرمان بکات هەوڵ دان ئەبێ هەبێ

چونکە پەروەردگار کرم یان دەنکە گەنم دروست ئەکات بۆ چۆلەکە بەڵام نایخاتە هێلانەکەیەوە

ئەو زاتەی منداڵی دا بە مریەم بەبێ هاوسەر

ئەیتوانی خورمای بۆ بەرداتەوە بێ هەوڵدانی خۆی

بەڵام ئەیەوێ ئێمە هەوڵ بدەین

و بشزانین ئەوانە تەنها هۆکارێکن نە سود و نە زیانی نابێ بێ ویستی خودا.

{يا لَيتني مِتُ قَبلَ هذا وَكُنتُ نَسياً مَّنسياً}

«مریەم ئاواتی خواست کە پێش ئەوەی ئەمەی بەسەر بێت بمردایە تا خەڵک گومانی خراپی پێ نەبەن خۆزگە من شتێکی بێڕێز بوومایە هەر باس نەکرامایە »

هەندێک سات بەسەر مرۆڤ دێت کە دونیا لەبەر چاوی تەنگ ئەبێت

وا هەست ئەکات هەموو ئەم گەردونە لەسەر سنگی ئەون

بەهۆی بێ ئیمانی نییە،بەڵام ژیان ڕەق و ناخۆشە

مریەم ئیمانێکی تەواو متمانەیەکی تەواوی بە خودا هەبوو

بە خودای وت :

کوڕێک بە بێ باوک لەدایک ئەبێ و ئەیهێنم بۆ لای ئەو دڵڕەقانە

دونیا لەبەر چاوی تەنگ بوو

هەندێک کات ڕوداوەکان ئەمانشکێنن

و ڕۆژانێکی سەخت بەڕێ ئەکەین

وا ئەزانین هەرگیز تێناپەڕێت

مرۆڤ بوونی خۆت بژی ئەگەر لاواز بووی یان بەهێز بووی بەڵام لە هەردوو حاڵەتەکە متمانەت بە پەروەردگار هەبێت.

{فَناداها مِن تَحتِها أَلا تَحزني قَد جَعَل رَبُكِ تَحتَكِ سَرِياً}

«لە خوارەوەی دارەکە جبریل یان عیسا بانگی کێ کرد (خەفەت نەخۆی)ئەوە پەروەردگارت کانیا و جۆگەلە ئاوێکی لەژێرتەوە دەرکردووە و تێئەپەڕێ لەو ئاوە بخۆ»

ئەگەر کەسێک پێویستی بە دڵنەوای هەبێ لەکاتە سەختەکان

ئەوە مریەمی ئیماندار باشترین کەس بوو

لەکۆتایدا مژدەی پێ درا،ئێمەش پێویستمان بە دڵدانەوەیە

ئەگەر مرۆڤێکت بینی ماندوو بوو بوو دڵی بدەوە

دڵی ڕاگرە تا دیسان بژیەتەوە

ئەبوبەکرد باشترین کەسە دوای پێغەمبەران و باشترین ئیمانی هەیە

بەڵام پێغەمبەر لە ئەشکەوتەکە دڵی دایەوە و وتی

ئەی ئەبوبەکرد خەمی دوو کەستە کە سێیەمیان خودایە؟

ئەبوبەکر خەمبار مەبە خودا لەگەڵمانە

تەنانەت پێغەمبەریش کاتێک خەدیجە مرد و مامی مرد و باشترین جەنگاوەری لەدەستدا

خودا ئاگاداری خەم و دڵشکاویەکانی بوو

ئەوکات بوو کە خودا لە ئیسرا و میعراج بردی بۆ لای خۆی تا دڵی بداتەوە

هەندێک جار دونیا هێندە لێت تەنگ ئەبێ هەموو دونیا ناتوانێ دڵت بدەنەوە.

{إني جَزَيتُهُم اليَوم بِما صَبَروا أنهُم هُم الفائِزون }

«ئەمڕۆ من پاداشتی ئەوانم دایەوە بەهۆی ئەو ئارامگرتنەی لە دونیا ئارامیان گرت ئەوان ئێستا براوەن و سەرکەوتوو و سەرفرازن »

ئارامگرتن لەپێناو خودا خوداپەرستیەکی گەورەیە

ئارامگرتن لەسەر سەرپێچیەکان

ئارامگرتن لەسەر خودا پەرستی

حەز و ئارەزوت بەند بکەیت

لەکاتێکدا ئەتوانی بیکەیت

چاوت داپۆشی لەسەر بینینی حەرام

هەموو ئەمانی ئارامگرتنن لەسەر تاوان و پاداشی لای خودا نوسراوە

خێر بکەیت لەکاتێکداپارەت زۆر خۆشئەوێ

و هەستی بۆ نوێژی بەیانی لە کاتێکدا خەوی بەیانیان زۆر خۆشە

و لەگەڵ دایک و باوکت چاک بیت لەکاتێکدا هەموو ژیانت ئاڵۆزە

ئەمەش ئارامگرتنە لەسەر خوداپەرستی

و پاداشی لای خودا هەیە

{رَبِّ اغفِر لي  وَهَب لي مُلكاً لا يَنبَغي لأحدٍ مِّن بَعدي}

«ئەی پەروەردگار لێم خۆشبە و موڵكێكم پێ ببەخشە كە تایبەت بێت بە من و لەدوای من بە كەسی تر نەدرێت »

سولەیمان دوعاكەی بە داوای لێخۆشبوون دەست پێ كرد

ئەمەش تەنها كاری پیاو چاكانە

چونكە هیچ شتێك نییە وەك تاوان ببێتە هۆی قبوڵ نەبونی دوعا

لەوانەیە كاتێك بەندەیەك داوایەك لە خودا ئەكات تەنها تاوانێك ڕێگر بێت لەوەی پێی بگات

ئەگەر قبوڵبوونی دوعات دواكەوت  بەخۆتدا بچۆرەوە

سەیرێكی ئەو تاوانانە بكە كە نوقم بووی تێیدا

هەرگیز وامەزانە بۆیە پێت نەدراوە چونكە داوای زۆرت كردوە ،هیچ شتێك زۆر نیە لای خودا

سولایمان داوای كرد جن خزمەتی بكات و زمانی ئاژەڵ بزانێت و با لەخزمەتی بێت

خودا هەمووی پێی دا بەڵام پێش هەموو شت داوای لێخۆشبونی كرد

ئەو پارەیەی لوتبەرزت ئەکا هەژارییە

ئەو بڕوا نامەیەی لوتبەرزت ئەکات نەزانییە

ئەو پلەوپایەی لوت بەرزت ئەکات شکستە

{قالوا سَمعنا فَتی یَذکُرُهُم یُقالُ لهُ ابراهیم}

«بیستومانە گەنجێک هەیە بە خراپە باسی خواکانی ئێمەی کردووە ناوی ئیبراهیمە»

ئیبراهیم لای ئەوان تەنها گەنجێک بوو

بەڵام لای خودا ئوممەتێک بوو

لەبەر ئیبراهیم یاساکانی گەردونی گۆڕی

خستیانە ئاگرەوە کەچی بۆی بوو بە ئارامی و ساردی و سەلامەتی

سارای هاوسەری تەمەنت گەورە بوو پیرێژن بوو

خودا چاکی کردەوە بۆی و ئیسحاقی پێ دا

بەدوای نرخی خۆت مەگەرێ لەچاوی خەڵکی

نرخت تەنها لای خودایە.

{فَصَبرٌ جَميلٌ وَاللهُ المُستعانُ عَلَىٰ ما تصِفونَ}

«ئارام ئەگرم بە ئارامگرتنێکی جوان کە هیچ گلەیی و گازندەی تیا نەبێ لە خوای گەورە داوای یارمەتی لە خودا ئەکەم بۆ ئەو وەفەی ئێوە ئەیڵێن»

سەلام و ستایش بۆ ئەو کەسانەی هەمووشت بە جدی وەرناگرن

ئەوانەی لەگەڵ هەر کەوتنێک ناگرین

و لەگەڵ هەموو وشەیەک ناوەستن

و هەڵەکانیان بە خەتای کەسانی تر نازانن

ئەوانەی ئەزانن ژیان ڕەش و سپییە

و خراپەش بەشێکی لێی هەروەکو چاکە

ئەوانەی بڕوایان وایە ئەمە تەنها ڕێگەیەکە

و ڕازی بوونی خودا باشترین ڕێگەیە کە بیگریتە بەر

{وَاللهُ أَحَقُ أَن تَخشاهُ}

«خوای گەورە شایەنترە کە لێی بترسی»

دواتر

خودا پەرستی پێش داب و نەریت

حەرام پێش عەیبە

ڕاستگۆیی پێش دەرخستن

کاری ڕاست پێش کاری ڕۆژانە

خودا پێش خەڵک.

تەنها تۆ خودایە ئازاری دڵی یەعقوبت ئەبینی کاتێک وتی

{إِنما أشكو بَثي وَ حُزني إِلىٰ الله }

«گلەیی و گازندە و سکاڵام تەنها بۆ لای خودا ئەبەم»

خودایە بەشێک لەو ئازارە لەدڵی مندایە ئێستا

بە گەورەی و ڕەحمەتی خۆت

چۆن خۆشی یوسفت خستە دڵی یەعقوب

خۆشیش بە دڵ من بدیت

درەنگ وەڵامدانەوەی پاڕانەوەکان

لەبەر ئەوەی کە پلەوپایەیەک هەیە لای خودا کە ئەبێ پێی بگەیت و هێشتا پێی نەگەشتوی

و لەبەر ئەوەیە کە دڵڕەقیەک لە دڵت هەیە

خودا ئەیەوێ نەرمی بکات

وەڵامدانەوە دوا ئەخات

تاکو بە پاڕانەوە هەموو لایەکی تاوانەکانت بگریت

و هەموو لوتبەرزی دڵت بەتاڵ بکاتەوە

و هەرجارێک هەستت کردووە کە تۆ لە کەسانی تر باشتریت

و هەموو تاوانێک بەچاوی کەم سەیرت کردووە نەک ڕەحمەت

لە دوای ئەوانە وەڵامت ئەداتەوە

خودایە پەنات پێ دەگرین لەوەی قاچەکانمان لار بێتەوە

دوای جێگیر کردنی

و پەنات پێ دەگرین کە خۆمان ئەوانە بکەین

کە ئامۆژگاری خەڵکمان کردووە کە نەیکەن

پەنات پێ دەگرین کە خودا پەرستیەکانمان

لوتبەرزمان بکەن

پەنات پێ دەگرین کە بە چاوی ڕق سەیری تاوانباران بکەین نەک ڕەحمەت

پەنات پێدەگرین لە نیعمەتێک لوت بەرزمان بکات

پەنات پێ دەگرین

و لە ترسی تۆ هەر بۆ لای تۆ ڕا دەکەین

لەسەر پێغەمبەر موسا:

{فَالقيهِ في اليَمِ وَ لا تَخافي}

«بیخە دەریاکەوە و مەترسە»

ئەمە بۆ دایکی بوو

{لا تَقتُلهُ}

«مەیکوژن»

ئەمە دایکەکەی تری بوو

{اذ تَمشي اُختُكَ}

«خوشکەکەی بەدوای دا ڕۆشت تا بزانێ لە کوێ ئەوەستێت»

ئەمە خوشکەکەی بوو

{يا أبتِ استأجِرهُ}

«باوکە بەکرێی بگرە تا شوانیمان بۆ بکات»

ئەمە هاوسەرەکەی بوو

هیچ پیاوێکی مەزن نیە ئافرەت لە پشتی نەبوبێ»

{إذ يَقول لصاحِبهِ لا تَحزن إن الله معنا}

«کاتێک بە هاوەڵەکەی وت دڵتەنگ مەبە خودا لەگەڵمانە»

هەندێک قسە وەکو باوەش وایە

هەندێل وشە هەن وەکو باوەش وان

ژیانمان لێ تەنگ ئەبێ

وشەیەکی میهرەبان لە هاوڕێیەک فراوانی ئەکا

هەندێک جار دڵمان ئەشکێ

دەستێکی میهرەبان لە خۆشەویستێکەوە چاکی ئەکات

هەندێک جار دڵەکانمان خەمبار ئەبن

باوەشی کەسێکی نزیک بەسە بۆ باشبونی

ئێمە لەم دونیایە تەنها میوانین

بۆیە ئاگاداری یەکتر بن

{وَحَرمنا عَلَيهِ المَراضِع مِن قَبل}

«خوای گەورە قەدەغەی کرد کە شیری کەسی تر بخوات»

کاتێک موسا برسی بوو

دەنگی گریانی کۆشکی فیرعەونی پڕ کرد

هەمووان بەزەییان پێدا ئەهات

بەڵام ئەو پەروەردگارەی شیری ئەوانی لێ قەدەغە کرد

میهرەبان تر بوو بۆی

ویستی بیباتەوە لای دایکی خۆی

ئەگەر ئێمە میهرەبانی خودامان بزانیبایە لەگەڵ هەر لەدەسدانێک

ئەوە ڕێگاکان زۆر ئاسان ئەبوو بۆمان.

{فانطَلَقا حتى إذا  أتيا أهل قرية استطعما أهلها فأبوا أن يُضيفُوهُما}

«بەڕێکەوتن تا چوونە دێیەکە ئەوانیش ڕەزیل و چرووک بوون و ڕەتیان کردەوە میوانداریان بکەن»

کاتێک نرخت نازانن

بیرت بێت موسا و خزر کەس نەبوو دەرکایان لێ بکاتەوە و لەتێک نانیان پێ بدا

ئەوەت بەسە کە خۆت بناسیت با ئەوانیش نەزانن

و سەرت بخەیتە سەر سەرین و ویژدانت ئارام بێت ئەگەر تۆمەتیشیان بۆ کردی.

کاتێک موسا ڕۆشت

ماڵی نەبوو

کاری نەبوو

هاوسەری نەبوو

خێرێکی کرد و چووە بەر سێبەرێک دانیشت

دەستەکانی بەرز کردەوە و وتی

{رَبِّ إِنِي لِما انزلت إلي مِن خَيرٍ فَقير}

«ئەی پەروەردگار خێرم پێ بکە زۆر پێویستم بە خێر و چاکەی تۆیە»

خۆری ئەو ڕۆژە ئاوا نەبوو

ماڵی دەست کەوت،کاری دەسکەوت،هاوسەریشی دەستکەوت

ئەم دوعایە بکەن دوای هەموو خێرێک

هەرکات دونیات لێ تەنگ بوو بیرت بێت

چۆن کەشتیەکەی نوح لەنێوان شەپۆلەکاندا وەکو چیا ئەهات و ئەچوو

چۆن ئیبراهیم لە ئاگر پارێزرا

چۆن یونس لە سکی حوتەکە ڕزگاری بوو

موسا چۆن دەریای لەت کرد بە گۆچانەکەی

جوانترین شت لە خۆشیەکانی خودا

ئەوەیە کە دوای ئەوەی هەموو دەرکاکانت لێ دائەخرێت دێت

و لە دڵی بەندەدا تەنها خودا ئەمێنێتەوە.

به یەک دوعا

خودا هەموو زەوی نوقوم کرد بۆ سەرکەوتنی نوح

به یەک دوعا

خودا پیرەژنێکی نەزۆکی چاککردەوە بۆ زەکەریا

بەیەک دوعا

خودا سکی نەهەنگی کردە شوێنێکی پارێزراو بۆ یونس

بەیەک دوعای ئیبراهیم کە وتی:

{فاجعل أفئِدةٌ مِن الناسِ تَهوي إِليهم}

«وا لە دڵی خەڵکی بکە دڵیان ڕاکێشی بۆ لای ئەو ماڵە بۆ ئەوەی حەج بکەن و عیبادەتی تۆی لێ بکەن»

مەککە تا ئێساش هەموو کەس دڵی بۆی ئەچێ

متمانەت هەبێ کە دوعا هەموو پەرش و بڵاویەکان ڕێک ئەخات

خودایە ئارامیەک لەسەر فەرمانەکانت وەکو ئارامگری هاجەرە

ئیبراهیم خۆی و کوڕەکەی لە بیابان جێهێشت

لە چەمێک نە ئاوی لێ بوو نە کەس

ئەم هەموو وردەکارییانە کەی گرنگ نەبوو

یەک پرسیاری کرد

(بە فەرمانی خودا جێمانئەهێڵی؟)

کاتێک ئیبراهیم وتی بەڵێ

هاجەرە وتی بڕۆ بەخوا خودا نامانفەوتێنێ

ئای خودایە دڵێکی ئەوها

ئیمانێکی ئەوها

دڵنیایەکی ئەوها

ئارامگریەکی ئەوها

عەرشی بەڵقیسی لە یەمەنەوە هێنا بۆ بیت المقدس بە چاوترووکانێک دواتر وتی

{هذا مِن فَضلِ رَبي}

«ئەمە فەزڵی خودایە بەسەرمەوە»

زولقەرنەین

ئاسنی هێنا و کردی بە ئاگر هەمووی بەتاڵ کرد

بەندێکی دروست کرد کە یەئجوج و مەئجوج نەیەنە دەرەوە لێی

دواتر وتی{قال هذا رَحمة رَبي}

«ئەمە ڕەحمەتی پەروەردگارە»

بۆ هەر پێویستیەکت داوات لە خودا کرد و وازت لە خەڵکی هێنا

بۆ هەر ئاواتێک کە بە خودات سپارد

بۆ هەر داوایەک کە داوات کرد تۆ لەبیرت کرد بەڵام خودا لەبیری ناکا

بۆ هەر شتێک کە ئەوەنە بە دڵ ویستووتە گریاوی بۆی

بۆ هەموو ئەمانە بە دڵنیایەوە بڵی

{يأتي بِها اللهُ إن الله لَطيفٌ خَبير}

«خوای گەورە بەدی ئەهێنێت هیچ شتێک لە خودا ناشارێتەوە»

یەکەمین چەکی بێ وێنە لەسەر زەوی بەکارهاتبێ دوعا کردن بووە

بە وردی ئەو ڕۆژەی نوح دەستەکانی بەرز کردەوە و وتی

{ربُ لا تُذِر عَلَى الأرض مِن كافِرين دياراً}

«ئەی پەروەردگار لەسەر ڕووی زەوی هیچ کافرێک مەهێڵە»

ئاگاداری ئەو کەسانە بە کە تەنها خودا پشت و پەنایانە

و تاکە چەکیان دوعا کردنە

{اقرأ باسم رَبِكَ الذي خَلَق}

«بخوێنە بەناوی ئەو خودایەی دروستی کردووی»

هیچ کەس لە دانیشتوانی سەر زەوی نەیئەزانی ئەو شەوە زەوی لە دیدارێکە لەگەڵ ئاسمان

کەس نەیئەزانی لە ئەشکەوتێکی تاریکی مەککەوە ڕوناکیەک دێت کە هەموو زەوی ڕوناک ئەکاتەوە تا هەتا هاتەیە

زەوی تینوو بوو بۆ ئاسمان

جبریل کە زیاتر لە ٥٠٠ سال بوو بە فەرمانی خودا نەهاتبۆ سەر زەوی

ئەم هەسارەیە پڕ بوو لە گومڕایی

بەشێک کە خاوەن کتێبەکان کە کتێبەکانیان سوتاندبوو

بەردێکیان ئەتاشی و ئەیانپەرست

لەو کاتەدا خودا ویستی سنور بۆ هەموو ئەمانە دانێ

بۆ کەسێک لە ئەشکەوتێکدا پێی ئەوترێ «بخوێنە»

ئەو هەتیوەی کە دایک و باوکی نەبوو ئێستا ڕێنیشاندەر ئەبێ بۆ باوکەکان و ژیانی دایکەکان ڕێک ئەخات

ئەو شوانەی شوانیی ئەکرد بۆ قوڕەیشەکان لەپێناو بڕە پارەیەک ئێستا شوانداری هەموو مرۆڤایەتی کەوتە سەر شانی

ئەو هاوسەرەی بە پارەی خێزانەکەی ئەژیا ئابوری هەموو دونیا ڕێک ئەخات.

ڕاستگۆی دەستپاک لەم شەوەوە دەست ئەکات بە کار بۆ ئەمانەتەکەی

ئەشکەوتەکە تاریک بوو،ئەویش قوڵ بوبۆوە و سەیری ئاسمانی ئەکرد لێوەی

و بیابانێکی لمی و لە نەفسی خۆی ئەیوت ئەم دیمەنە لە دروستکردنی بەردێک بێت کە قوڕەیش خۆی دروستی کردووە و خۆیشی ئەیپەرستێ

و جبریلی لە پێش خۆی بینی

بێ پێشەکی وتی بخوێنە

محمد ئەڵێ:خوێندەوار نیم

دوبارەی ئەکاتەوە:بخوێنە

محمد ئەڵێ:خوێندەوەر نیم

بۆ سێیەم جار ئەڵێ:بخوێنە

محمد ئەڵێ:چی بخوێنم؟

جبریل توند ئەیگوشێ و ئەڵێ

{أقرأ باسم ربك الذي خلق}

لەم ئایەتە فێری چی ئەبین:

یەکەم:

یەکەم وشەی قورئان»بخوێنە» بوو نەک نوێژکردن یان ڕۆژوو گرتن

واتە خودا پەرستی پێویستە زانست و زانیاری پێشی بکەوێت

نوێژکردن بێ زانست و زانیاری وەکو ریازەیەکی لێ دێت

و ڕۆژوو گرتن وەکو ڕیجیم کردنێک

سوڕانەوە و تەواف کردن وەکو کێشداگرتنێکی لێ دێت

نەیوت جیهاد بکە چونکە جیهاد بێ زانست ئەیانکات بە بکوژ و کوژراو

پێی نەوت بازرگانی بکە چونکە بێ زانست حەڵال و حەرامی تێکەڵ یەکرد

خودا بە نەزانینەوە ناپەرستێ

ئەو کتێبەی بە « بخوێنە » دەستی پێ کرد ڕازی نییە بەوەی خوێندەوارەکانی نەزان بن

دووەم:

کاتێک لە ئەشکەوتەکە هاتە خوارەوە ئەلەرزی لە ترسا و ئارەقی ئەکرد ،نەچووە لەی حەمزەی مامی کە پێی ئەوترا ڕاوچی شێرەکان تا بیپارێزێ

نەچووە لەی هاوڕێ دڵسۆزەکەی ئەبو بەکر تا دڵی بداتەوە

نەچووە دار الندوە کە قوڕەیشیەکانی لێبوو تا پرسیان پێ بکات

چووە لای خەدیجە ئەو هەم مامی بوو هەم هاوڕێی هەم عەشیرەتی

خەدیجە هەموو پارە و سامانی خۆی ئەخستە دەستی چونکە پێی عەییب بوو ژن و مێردێک لەسەر هەمان جێگە بن بەڵام پارەیان جیا بێت

بوو بوو بە باوکی کە خۆی نەیبینیبوو

بوو بوو بە دایکی کە بەمنداڵی لەدەستی دابوو

بوو بوو بە باپیری کە بەخێوی کرد

بوو بوو بەو خوشک و برایانەی کە هەرگیز نەهاتنە دونیا

و زۆریش دڵسۆز بوو بۆی

تا ئەو هەبوو زەواجی لەگەڵ کەسی تر نەکرد

هەندێک ئافرەت ئافرەتانی تر تەنها ئەکەن بە ژمارەیەک و بەلەدەسدانیان هەموو ئافرەتی دونیا وەک یەک ئەبن بۆت

عائیشە هەمووکات غیرەی لێ ئەکرد لەکاتێکدا ئەو لە گۆڕدا بوو

ئەیوت هێشتا باسی ئەو ئەکەی لەگەڵ ئەوەی خودا باشتری پێت داوە؟

پێغەمبەر ئەیوت:سوێند بەخوا لە خەدیجە باشترم پێ نەدراوە

ئای لەو وەفایە

کاتێک تەمەنی بوو بە ٦٠ ساڵ هاوڕێکانی خەدیجە بوبون بە ٨٠ ساڵ

عەباکەی دانا تا ئەوان دانیشن لەسەری و ئەیوت ئەوانە هاوڕێی خەدیجەن.

وَشرَوهُ بِثَمن بَخَسٍ دَراهِمَ مَعْدُودةٍ وَكانُوا فيهِ مِن الزاهِدينَ}

دونیایەک یوسفی تێدا فرۆشرا

و نوح بە درۆ خرایەوە

ئیبراهیم خرایە ئاگرەوە تێیدا

موسا بە سیحر تۆمەتبار ئەکرێ

محمد تێیدا بەرد باران بکرێ(صلى الله عليه وسلم)

ئایا چاوەڕوانی ئەوەی لێ ئەکەی دەست بەسەر شانی تۆدا بهێنێ؟

ئەم هەسارەیە کۆسپە

لە ڕەحمەتی خۆی کردویەتێ شوێنی چاندن نەک دورینەوە

ئەوە بچێنە کە حەز ئەکەی سبەی بەرت بێت

واز لە خەڵک بێنە

ئێستا کاری چاک،ئاڵۆزیە

ئەوەی دەست بەدینی بگرێت،جدییە

ئەوەی جیهاد بکات لەپێناو خودا ،تیرۆرستە

و ئەوەی ئەچێت بۆ مزگەوت ، ئەڵێن هیچ شوێنێ تری نییە بۆی بچێت

قورئان خوێن لایان دواکەوتوویە

هەرچەندە ئێمە ئەو ئومەتەین کە پێمان وترا بخوێنە

خۆت بیت و ئەوان وازت لێ بێنن زۆر باشترە لەوەی وەک ئەوان بیت و واز لە خۆت بێنیت

{قُلنا لا تَخَف إنك أنت الأعلى}

«مەترسە هەر تۆ زاڵ و سەرکەوتوو و بڵندی تۆ ئەیبەیتەوە بە ئیزنی خودا»

تاوان ئەگەر شەڕەکەش بەدەس بهێنێ

بەڵام حەق جەنگەکە ئەباتەوە

نەمرود شەڕەکەی بردەوە

بەڵام ئیبراهیم جەنگەکەی بردەوە

فیرعەون شەڕەکەی بردەوە

بەڵام موسا لە جەنگەکە سەرکەوت

محمد(صلى الله عليه وسلم)لە مەککە دەرچوو بەدزیەوە لە تاریکیدا

بەڕۆژی ڕوناک گەڕایەوە بۆی و لە هەر چوار دەرکاکە چووە ژورەوە

بەوە فریو مەخۆ کە ستەمکار شەڕێک بباتەوە

یا. حەق جەنگەکەی نەبردۆتەوە هێشتا

خودا کەوتنی ستەمکار دوا ئەخات چونکە ئەیەوێ ببێتە دەرسێک

سەرکەوتنی حەقیش دوا ئەخات چونکە ئەیەوێ  پاکی بکاتەوە

ئەگەر ستەم گەشتە لوتکە ئەوە سەرکەوتنی حەق نزیکە

بیرت بێت تاریکترین بەشی شەو ئەو کاتەیە کە کەمێک پێش ڕۆژهەڵاتنە

{فناى في الظُلماتِ أن لا إله إلا أنتَ سُبحانك إني كُنت مِنَ الظالمين}

«له تاریكیدا هاواری كرد پەروەردگار هیچ پەرستراوێک بە هەق نییە شایەنی پەرستن بێت جگە لە تۆ بەڕاستی من لە ستەمكاران بووم»

بابەتەكە هەرگیز لەبارەی مۆم و گڵۆپ نەبووە

بەڵكو دڵەكان بوو

هیچ زیانت پێ ناگەیەنێ ئەگەر هەموو دونیا ڕوناكیەكان بەڕوتدا بكوژێننەوە لەكاتێكدا ڕوناكی لە دڵتدا هەبێ

و سودی بۆت نابێ ئەگەر ڕوناكی خۆر و مانگ لەسەر شانەكانت بن ئەگەر دڵت تاریک بێت

سەیری یونس بكە سێ تاریكی كۆبۆوە لێی:

تاریكی شەو

تاریكی دەریا

تاریكی سكە نەهەنگ

ئایا هیچ زیانی پێ گەشت؟

هەر تاریكیەک لە دڵدا نەبوو ئاسانە

سەیری ئەو بكە نێردراوی خودایە

تا نەهی لە درۆ و کاری خراپە و ڕیبا بکات

کاتێک توڕە ئەبوو خودا توڕە ئەبوو

کاتێک لە سکی نەهەنگدا بوو بانگی پەروەردگارە ئەکرد

یونس چەند بە ڕێزەوە داوای یارمەتی ئەکرد

موناجاتەکەی چەندە جوان بوو

بەوە لە خودا نزیک ئەبێتەوە کە کەم وکوڕیەک لە خۆیدا هەیە نەک بە کارە چاکەکانی

ئێمەش ئەگەر دوو ڕکات نوێژ بکەین وەک ئەوەیە بەهەشتمان مسۆگەر کردبێ

سەیری دڵەکانتان بکەن سودی هەسارەیەکی ڕوناک چییە

لە ڕۆژی دوایدا لە کاتێکدا دڵت تاریک بێت

{فلما وضعتُها قالت رَب إني وَضعتُها أنثى والله أعلمُ بِما وَضَعَت وَليسَ الذكر كالانثى وَأني سَميتُها مريم و إني أعيدها بك وذُريتها من الشيطان الرجيم}

«كاتێک منداڵەکەی بوو بینی کچە وتی ئەی پەروەردگار ئەمە کچە خەفەتی خوارد ،خوای گەورە خۆی باشتر ئەزانێت

دایکی وتی ئەی پەروەردگار کچ وەکو کوڕ نییە ناتوانێ خزمەتی مزگەوت بکات

من ناوی ئەنێم مریم پەنات پێ دەگرم لە شەیتانی نەفرەتلێکراو لێی خودایە خۆی و نەوەکانی بپارێزە

«

ئەم قسانە لەسەر زمانی هاوسەر عمران

کەچی ئەو کچە ئێستا ئایەتێکی قورئانی لەسەرە

چیرۆکەکە بە کورتی تا تێبگەین:

هاوسەری عمران دوای چەندین ساڵ منداڵی نوو

نەزری کرد ئەگەر خودا کوڕێکی پێ بدات تەنها بۆ خزمەتکردنی مزگەوت گەورەی بکات

بەڵام کچی بوو

لەو سەردەمەدا ناگونجا ئافرەت ئەگەر بۆ خودا پەرستنیش بوایە جیابوایەتەوە لە دایک و باوکی و خزمەتی مزگەوت بکات

بەڵام چونکە عمران بەڕێز بوو لایان بەخێرهاتنی مریەمیان کرد

ویستیان بزانن کێ مریەم بەخێو ئەکات

چونکە هەموویان ئەیانویست لای ئەوان بێت

وتیان چەند قەڵەمێک ئەخەینە ئاوەوە هی کێ وەستا ئەو کەسە مریەم گەورە ئەکا

سێ جار دوبارەیان کردەوە هەر زەکەریا دەرچوو

زەکەریا مێردی پوری مەریەم بوو بۆیە ئەو لەگەڵ خۆی بردی

لێرەدا ئەم ئایەتە هەیە

{وَلیس الذکر کالأنثی}

«کچ وەکو کوڕ نییە»

لەناو خەڵکی وا بڵاو بوو کە ئەم ئایەتە شوێن و مەکانەتی ئافرەت کەم ئەنرخێنێ

و کوڕ بەباشتر دائەنێت

بەڵام ئەم تێگەشتنە هەڵەیە

ئەگەر ئایەتەکە بیوتبا کوڕ وەکو کچ نییە

ئەوکاتیش ئەوترا کچ بە باشتر ئەزانرێ

بەڵام ئایەتەکە واتای ئەوەیە پیاو لە هەندێک کاردا لە ئافرەت باشترە

و ئافرەت لەهەندێک کاردا لە پیاو باشترە

و کاتێک خودا ئەڵێت ئافرەت بونەوەرێکی سەنجڕاکێشە لای پیاو

لە ڕووی دروستبونی جەستیەی و دەرونی

چونکە خودا ئافرەتی پێ تایبەتە

تایبەتی پلەو پایەیە نەک کەمی

ئەوانەی داوای یەکسانی مافی پیاو و ئافرەت ئەکەن ئەگەر بزانن یان نەزانن ئافرەت کەم ئەکەنەوە

بەڵام پیاو پیاوە و ئافرەتیش ئافرەتە هەریەکەیان شێواز و دروستبونیان جیاوازە

و کار و باری ژیانیشیان لەگەڵ جەستەیان ئەگونجێت

کاتێک ئیسلام جیهاد کردنی لەسەر ئافرەت لابرد ئەمە مانای کەمی ئافرەت نەبوو

بەڵکو بەرزی و بەڕێزی ئافرەتە

چونکە ئافرەت لە ئیسلامدا زۆر ناسکە

کار و بارێکی هەیە کە لەگەڵ ئەم ناسکیەی ئەگونجێ کە خودا بۆی هەڵبژاردووە

ناخۆشترین قسە بە ئافرەت بوترێ:تۆ وەک پیاویت

ئافرەت توڕە ئەبێت و زۆری پێ ناخۆش ئەبێ

نەکا لەبەر ئەوەی پیاو ترسناکە

بەڵام ئافرەت ئەزانێت جوانترین شت کە هەیبێ ئافرەتیی و خانمیەتیەتی

بەڵێ پیاو وەکو ئافرەت نیە

ئێوە بەم دێڕە بەرز و بەڕێز ئەبن

ئێوە لە ڕوخساردا جوانترن لە پیاو

و هەست و میهرەبانیتان زیاترە

و ڕاستگۆترن لە خۆشەویتسیدا

ئارامگرترن لەسەر کار و باری خێزان

ئەتوانن بەرگەی توڕەبون و بۆڵە بۆڵی پیاو بگرن

و من سوێند ئەخۆم ئەگەر پیاو بیتوانیبا دوگیان بێت و منداڵی ببێت

پیاو لەتوانایدا نەبوو لە یەک منداڵ زیاتر بهێنێ

بەڵام ئافرەت گەورە و بەهێزە

مردن ئەبینێ لەکاتی منداڵبوون

بەڵام هەمووکات حەزئەکات هەستی دایکایەتی دوبارە بکاتەوە

و ژیان ببەخشێت بەم هەسارەیە

ئێمە لە خۆڵ دروست کراوین

کار ئەکەین،ماندوو ئەبین،دەربەدەر ئەبین،و بەرهەممان ئەبێ

ئێوە لە ماسولکەیەک دروستکراون لە نزیک دڵ

بۆیە بەخۆشەویستیەوە ئەژین

بۆیە شێتانە ئاشق ئەبن

ئافرەت لە یەک پیاودا هەموو دونیا ئەبینێ

لەکاتێکدا یەک پیاو هەموو ئافرەتی سەر زەوی بەشی ناکات

بەقسەکانیان فریو نەخۆن کە ئەڵێن ئەبێ هەمان مافتان هەبێ لەگەڵ پیاودا

ئێوە شایەنی جیاواز بونن تایەبتبوون

ئێوە لایەنی ناسکی و جوانی و شیرینین بۆ مرۆڤایەتی

ئەم هەسارەیە پێویستی بە پیاوی زیاتر نییە

ئەوەندە پیاوەی ئێستا بەسە

جەنگاوەر و بازگان و کرێکار و ئەندازیاری بەسە

بەڵام خۆشەویستی کەمە

ئێوەش خۆشەویستی بنچینەی هێزەکەتانە

مەهێڵن خانمیتان لێ بدزن بەناوی یەکسانیەوە

بە ئافرەتی بمێنن و شانازی بکەن

هەروا ناسک بمێنن

بەرگری لە ئافرەت بوونی خۆتان بکەن

{وَلَقد هَمَت بهِ وَهُم بِها لوْلا أن رأى بُرهان رَبهِ كذلك لِنصرِف عَنهُ السوء و الفحشاء إنهُ مِن عِبادِنا المُخلِصين}

«ئافرەتەکە ویستی خراپە لەگەڵ یوسف بکات

ئەگەر بەڵگەی خوای گەورەی نەبینیایە ئەوا یوسفیش دڵی بەلایدا ئەچوو

بەڕاستی ئەو یەکێک بوو لە بەندە هەڵبژێراو و دڵسۆز و چاک و پاکەکانی خودا»

ئەمە یەکێکە لەو ئایەتانەی کە زۆر ڕای جیاوازی لەسەر هەیە

ڕاستە هەموویان لەسەر ئەوەن کە یوسف خراپەکاری نەکرد بەڵام ڕای جیاوازیان هەیە لە ڕونکردنەوەی دا

هەندێک پێیان وایە یوسف دڵی بەلایدا چووە بەڵام خودا هۆکارێکی بۆ نارد تا دور کەوێتەوە

هۆکارەکەش بینینی وێنەی یەعقوب بووە

ئەی زمان چی ئەڵی لەم بارەیەوە؟

یەکەم

ئەلهم یەکێکە لە زمانەکان وەکو زمانی عەرەب بەواتای قسە کردن لەگەڵ نەفسی خۆت

واتا پێش ڕودانی هەر شتێک

ئەمەش مانای چاکەیە لای عەرەب

زیاتر ورد ئەبینەوە لەسەر قسەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی ئەم زمانە

هەرکەس لە نیەتی نەفسیدا ویستی چاکەیەک بکات بەڵام نەیکرد

هەر بە چاکە بۆی ئەنوسرێ

واتە هەرکەس نەفسی خۆی بە چاکە ڕێگەی نیشان بدا و نیازی کردنی هەبێت

واتا ئەمە لە قاڵبی بیرۆکەدایە نەک کردار

بەڵام کردار دوو هەڵبژاردنی هەیە:

یەکەم ئەیەوێ بیکات دوومیش یان دودڵە یان نایەوێ

ئەوەی زوڵەیخا لە بیرۆکە دەرچوو بوو بە کردار ئەم ئایەتەش ئەیسەلمێنێ:

{أنا راودتهُ عَن نَفسهِ}

«من داوام لە یوسف کرد کاری خراپەم لەگەڵ بکات»

ئەی نەفسی یوسف چی وت؟

ئەگەر خودا بیوتبا:زوڵەیخا یوسفی ویست بۆ کاری خراپە و یوسفیش ویستی بەاڵم هەردوکیان لە نەفسیان

ئەوە هەردوکیا. یەکسان ئەبون

بەڵام خودا ئەڵێت:

{وَلَقَد همت بهِ وَهم بِها لولا أن رأى بُرهان ربهِ}

«نەفسی زولەیخا ویستی و یوسفیش نەفسی ئەیویست ئەگەر خودا بەڵگەی نیشان نادایە»

لێرە ڕاستی دەرئەکەوێ

لە ئایەتەکە پێشکەوتنێک و دواکەوتنێک هەیە

کە زۆر کەس لێی بێ ئاگایە

بەواتەیەکی تری ئایەتەکە نەفسی یوسف ئەوی ئەویست ئەگەر خودا بەڵگەی نیشان نەدابا

وەکو ئەوەیە بڵێیت ئەگەر ئەو جلە ئەوها گران نەبوایە ئەمکڕی

ئێهـ بەڵام خۆ نەمکڕی

نەفسی یوسفیش زولەیخای نەویست

لەوەیە یەکێک بڵی ئەی بۆ خودا ڕاستەوخۆ وای نەوت ئایا ئەوها ئاسانتر نابوو؟

وەڵام:نەخێر

چونکەی ئەگەر بوترایە :نەفسی زولەیخا ویستی بەڵام نەفسی یوسف نەیویست

لێرە لە ڕووی زمانی عەرەبیەوە ماناکە تێک ئەچوو

و لەوەیە بوترێ نەیویستووە چونکە شلەژاوە

یان لە هاوسەرەکەی ترساوە یان شۆک بووە

ئایەتەکە بۆ پاکبونی یوسف دابەزیوە نەک زیادکردنی گومان لەسەری

دووەم:

دێینەوە سەر ئایەتەکە:

{كذلك لِنُصرِفَ عنهُ السوء و الفحشاء}

«ئەمەش بۆ ئەوەی لە کاری خراپ و کاری پیس بیپارێزین»

سەیری وردی دەربڕیەنەکە بکە:

تا لە کاری خراپ بەدوری بگرین

نەیوت تا کاری خراپ لێی دوربێت

چونکە خراپەکە دوای یوسف کەوتبوو

نەک یوسف دوای بکەوێت

سێیەم:

کۆتای ئایەتەکە خودا وەسفی یوسف ئەکات

خودا ئەفەرموێ{إنهُ مِن عِبادِنا المُخلَصِين}

جیاوازی هەیە لە نێوان وشەی(مُخلَصین ) و (مُخَلصِین)

وشەی یەکەم بەمانای کەسێک دێت کە

دڵسۆز بێت بۆ خودا و خودا پەرستی و هاوەڵی بۆی دانەنابێت

ئەو کەسانەن کە خودا پەرستیەکانیان زیاترە لە تاوانەکان بەڵام ئەکردێ توشە تاوان ببن

وشەی دووەم کەسێکە کە خودا ڕزگاری کردبێت

و ئەم وەسفە بۆ هەموو پێغەمبەران بەکارهاتوە

کاتێک خودا باسی موسای کرد هەمان شتی وت کە لەسەر یوسف وتی

خودا ڕزگاری کرد و نێردراوێکی باش بوو

{وَقُلنا يا آدم اسكن أنت وَزَوجتُكَ الجنة وَ كُلا مِنها رَغداً حَيثُ شِئتُما وَلا تَقرِبا هذه الشجرة فَتَكونا مِن الظالمين}

«ئەی ئادەم خۆت و حەوای خێزانت نیشتەجێ بن لە بەهەشت بەویستی خۆتان ژیانێکی خۆش بەسەر ببەن ویستتان لە چیە لە بەهەشت بیخۆن بەڵام لەم دارە نزیک مەبنەوە و زوڵم و ستەم لە نەفسی خۆتان مەکەن»

تەنانەت بەهەشتیش شوێنی تاقیکردنەوە بوو

کە ئەوێ شوێنێکی هەمیشەییە

ئەی چی لەسەر زەوی کە تێدەپەڕێت

بەڵام سەیری ڕەحمەت و بەزەیی خودا یەک دارێکی حەرام کرد کەچی هەموو دارەکانی بەهەشتی پێدان

بەڵام شەیتان هەر وابووە ،حەرام جوان ئەکات لەپێش چاوی خەڵکی

لەگەڵ ئەوەی تەنها درەختێک بوو و هیچ جیاواز نەبوو لە درەختەکانی تر

بەڵام شەیتان هەستیارترین دەماری مرۆڤ ئەگرێت

ئادەم بە ژیانی هەتا هەتای فریوی خوارد

خودا لە بەهەشت گرەنتی برسی نەبون و داپۆشراوی بۆ کرد

ئەی ئەم دونیایە کە خودا کردویەتی بە ڕێڕەوێکی تێپەربوو

شوێنی ماندوو بوون

شوێنی نەخۆشی و پیری

بەڵام هەمان چیرۆکی کۆنە

فراوانبونی حەڵال و کەمی حەرامەکان

بەڵام ئیبلیس حەڵالەکان لەچاوی خەڵک تەسک ئەکاتەوە

کاتێک خودا ڕیبای حەرام کرد زۆر ڕێگەی حەڵالی تر هەیە بۆ پارە پەیا کردن

بەڵام ئیبلیس وامان لێ ئەکا هەست بکەین ئەوە ئاسانترین ڕێگەیە

کاتێک مەشروبی حەرام کرد زۆر خواردنەوەی تر هەیە بەڵام ئیبلیس لای خەڵکی جوانی ئەکا

کاتێک گۆشتی بەرازی حەرام کرد زۆر گۆشتی تر هەیە

بەڵام ئیبلیس وا ئەکات هەست بکەین حەرام خۆشترە

کاتێک زینای حەرام کرد زەواج هەیە

بەڵام ئیبلیس ئەوە جوان ئەکات لە چاوی خەڵک

ئەگەر بە ناچاری دەرکرابین لە بەهەشت

ئەوە ئێمە لەسەر زەوین

و دوو ڕێگەی هەیە

ڕێگەی بەهەشت و ڕێگەی دۆزەخ

خۆتان ڕێگەی خۆتان هەڵبژێرن.

{وَما مِن دابةٍ في الأرض إلا على الله رِزقُها وَ يَعلَم مُستَقَرَها وَ مُستودِعها كُلٌ في كِتابٍ مُبين }

«هیچ ئاژەڵێک نییە لەسەر زەوی ئیللا ڕسق و ڕۆزی لەسەر خوای گەورەیە و ڕسق و ڕۆزی هەموویان ئەدات و شوێنی نیشتەجێبونیان لەناو ڕەحم یان لەسەر زەوی ئەزانێت

و ئەو شوێنە ئەزانێ کە ئەچنە ناوی و بۆی ئەگەڕێنەوە کە مردنە هەموو ئەمانە لە کتێبێکی ئاشکرا تۆمار کرداوە»

زۆرترین شت کە مرۆڤ بەدوایدا ڕابکات ڕسقە

بەڵام هەرچەند ڕابکات هەر ئەوەنەی پێ ئەدرێ کە بۆی نوسراوە

و ئەو شتەی زۆر لێی ڕائەکات مردنیەتی

بەڵام هەرچەند ڕابکات هەر ئەوەنە ئەژی کە بۆی نوسراوە

پێش ئەوەی وەکو میوان بێینە سەر زەوی هەم ڕسق و هەم مردنمان نوسراوە

و میوان لەوە زیاتری پێ نادرێ کە خاوەن ماڵ ئەیەوێ پێی بدات

و تەمەنی زیاتر ناکات لەوەی کە خاوەنی ژیان پێی داوە

ئارام بن و ورد ببنەوە:

دەنکێک گەنم لە وڵاتێک ئەچێنرێ

ئەکرێ بە نان لە وڵاتیکی تر

دواتر دێتە دەستی تۆوە تا بیخۆیت

چونکه وا بۆی نوسراوه که تۆ بیخۆی

بەم شێوەیە هەزاران کەس کار دەکەن تاکو ئەو بگات بە تۆ

و تۆ و هەزاران کەسی تر کار دەکەن تا بگات بە کەسێکی تر

ئەگەر بێت مرۆڤ  لە ڕسقەکەی ڕابکات  بەهەمان شێوەکە  لە مردنی ڕائەکات

ئەوا ڕسقەکەشی وەکو مردنەکەی دوای ئەکەوێ

{وَما مِن دابةٍ}

«هیچ گیاندارێک نییه»

له زمانی عەرەبیدا هەموو ئەوانەی پێ لەسەر زەوی بنێین گیاندارن

وەک چۆن هەموو ئەوەی له زەوی بەرزتر بێت ئاسمانه

و ڕسقی هەموو خەڵک پێکەوه تەنها پەڕەیەکه له کتێبی ڕسقی ڕسقەکان که پەروەردگار دایناوه

ئەگەر ئێمه حەوت ملیار کەس بین

ئێمه کەمترین ئومەتین لەسەر زەوی

بەرانبەر هەر مرۆڤێک زیاتر له هەزار مێروله هەیه

{إلا عَلَىٰ الله رِسقُها}

«ڕسقی تەنها لەسەر خودایه»

هەموو ئەوانەی که ڕسقێک بۆ کەسێکی تر ئەکڕێت تەنها هۆکارێکن

ئەو ڕادەیه و بەو چۆنیەتیه ئەیکڕن که خودا نوسیویەتی

فریشتەکان باران ئەبارێنن بەڵام یەک دڵۆپ نابارێت بێ ویستی خودا

و ئەو خێرەی ئەیخەیتە دەستی هەژارێک ڕسقێکە خودا خستیەتێ گیرفانت

هەموو شتێک بە وردی نوسراوە،پشوو بدە

{وَكان عِندَ الله وَجيهاً}

«کەسێکی خاوەن پلە و پایە بووە لای خودا و خودا دوعای قبوڵ کردووە»

ئەمە پیوەری خودایە نەک خەڵکی

نوحیان بە درۆزن زانی

ئیبراهیمیان خستە ئاگرەوە بیسوتێنن

ویستیان موسا بکوژن

ساڵحیان ماندوو کرد

بێ فەرمانی شوعەیبیان کرد

یەحیایان کوشت

زەکەریایان بە مشار پارچە پارچە کرد

ویستیان عیسا لەخاچ بدەن

و محمد(صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵەکانی

لە مەککە بە درۆزنیان زانی

لە تائیف بەردباران کران

لای ماڵی خۆی پلانیان دانا بیکوژن

لە ڕێگەی کۆچکردنی بەدوای کەوتن

لە غەزای بەدر و ئوحود شەڕیان لەگەڵ کرد

بە پارچە گۆشتێک ژەهراویان کرد

ئەی تۆ چاوەڕێی چیت لە خەڵکی؟

خەڵکی ئەگەر خێر بکەیت ئەڵێن:بۆ ڕیایە

ئەگەر دەست بەماڵتەوە بگری ئەڵێن ڕەزیلە

ئەگەر ئامۆژگاری بکەی ئەڵێن عەیب لە خەڵک ئەدۆزێتەوە

ئەگەر بێدەنگ بیت ئەڵێن ترسنۆک

ئەگەر بازرگان بیت ئەڵێن بۆ پارە چی ئەکا

ئەگەر لەماڵ دانیشیت ئەڵێن ئیشی پێ ناکرێ

ئەگەر ڕەخنە بگری ئەڵێن چاوی کە عەیبەی خەلکە

ئەگەر بێدەنگ بیت ئەڵێن تێکەڵمان نابێت

خەڵکی ئەوهان

کەسانی بەنرخیان تێدایە بەڵام زۆربەی ئەوهایە

تۆ خۆت بە

ڕاستە ئەوەی چاودێری خەڵک بێ لە خەفەتا ئەمرێ

بەڵام ئەوەی گوێ بە قسەیان بدات لە خەفەت و خۆ خواردنەوە و دڵتەنگی ئەمرێ

{إن الله يُحب التوابين وَ ًيُحِبُ المُتطهرين}

«بێگومان خودا تۆبەکارانی خۆشئەوێت و پاکەکانی خۆشئەوێت»

وشەی (التوابين)سیغەی موبالەغەیە بەواتای زیادەڕەوی لە شتێک

واتا زیادەڕەوی ئەکەن لە تۆبە کردن

و کاتێک زۆر تۆبە بکەن زۆرکات زۆریش هەڵە ئەکەن

سەیری ڕەحمەتی خودا و وردبینی باسکردنی

نەیوت تۆبەکاران قبوڵ ئەکات

نەیوت لە تۆبەکاران خۆشئەبێ

نەیوت لێیان ئەبورێ

بەڵکو ئەڵێ تەوبەکارانی خۆشئەوێ

بەڵێ ئەو کەسانەی خۆشئەوێ کە هەڵە ئەکەن و بە داوای لێخۆشبونەوە دێنەوە لای

ئەوانەی خۆشئەوێ کە بەڕۆژ بێ فەرمانی ئەکەن و بە شەو داوای لێخۆشبوون ئەکەن

وای نەوتووە تاکو هانمان بدات بۆ تاوان

بەڵام نایەوێ شەیتان بکەوێتە نێوان ئێمە و ئەو

ئەیەوێ پێمان بڵێت تاوان هەرچەند گەورە بێت ،لێخۆشبونی ئەو گەورەترە

هەرچەند تاوان دوبارە بێتەوە ئەو بێزار نابێ کە لێخۆشبوون لێمان
تاکو ئێمە بێزار بێن لە گەڕانەوە بۆ لای

بەتەواوی تێکەڵی خەڵکی مەبە

شتێک لەخۆت بۆ خۆت هەڵبگرە

{فلا تُغَرَكُم الحياة الدُنيا وَلا يَغُرَكُم بالله الغرور}

«جوانی و ڕازاوەیی و ژیانی دونیا فریوتان نەدا و لەخشتەتان نەبا و با شەیتانیش بەهۆی خوای گەورە لە خشتەتان نەبات بەوەی کە خودای گەورە زۆر بەخشندەیە و بەڕەحم و بەزەییە»

پرسیار لە نوح بکە سەبارەت بە هەزار ساڵی تەمەنی لەسەر زەوی پێت ئەڵی تەمەن کورتە هەرچەند درێژبێتەوە

پرسیار لە سولەیمان بکە لەسەر پاشایی و دەسەڵات لە کاتێکدا موڵکی خۆرهەڵات و خۆرئاوای لەژێر دەستا بوو

پێت ئەڵێ مرۆڤ هەژارە هەرچی هەبێ

پرسیار لە داود بکە لەسەر هێز لەکاتێکدا ئاسنی نەرم ئەکرد

پێت ئەڵێ مرۆڤ لاوازە هەرچەند بەهێز بێت

پرس بە فیرعەون بکە لەسەر ئەو دەریایەی دای بەسەریدا

پێت ئەڵێ کە تامی خوێی دەریاکە شیرینی دەسەڵاتی بیرم بردەوە

پرسیار لە نەمرود بکە لەبارەی ئەو مێشولەیەی مێشکی

پێت ئەڵي کە سوکایەتی هیچ بەرز و بڵندی بۆ نەهێشتم

پرسیار لە پیاو چاک و پیاو خراپ بکە کە ژیانیان کۆتایی هاتووە پێت ئەڵێن پشت مەدە بە دونیاوە.

{الذين يُؤمِنُون بِالغيب وَ يُقيمون الصلاة}

«ئەوانەی باوەڕیان بە غەیب هەیە و نوێژەکانیان ئەکەن»

زانستی ڕاست مەحاڵە لە دژی ئاینی ڕاست بوەستێت

زانست چەند جارێک ڕای خۆی گۆڕی سەبارەت بە بابەتێک

بەڵام ئەم کتێبەی ئێمە هەمانە بەو شێوەیەی خۆی ماوەتەوە ماوەی هەزار و چوارسەد ساڵ

بەڵکو زانست هەرچەند پێشبکەوێ ڕاستگۆی و بەرزی و بڵندی ئەم کتێبە دەرئەخات

هەرچەندە پێویستی بە زانست و زاناکان نییە تا ڕاست بێت

بەسسزمانن ئەوانەی تەنها باوەڕ بەوە ئەکەن کە خۆیان ئەیبینن

لەوانیش خراپتر ئەوانەن کە باوەڕیان بە غەیبی زانست هەیە

باوەڕ بو خودا ناهێنن چونکە نایبینن،کەچی باوەڕیان بە تیشکی سەروو بنەوشەیی هەیە و ناشیبینن

باوەڕ بە فریشتە ناکەن چونکە نابینرێ کەچی باوەڕ بە تیشکی سور ئەکەن هەرچەندە ئەویش نابینرێ

باوەر بە خێری بوراق ناکەن بەڵام باوەر بە خێرایی ڕوناکی ئەکەن

ئەوەیان بیرچوە کە زانستەکەیان پێشتر ئەیوت زەوی لەسەر شاخ بەران وەستاوە

قورئانیش ئەیوت

{وَكُلٌ في فَلَكٍ يسبَحون}

«هەمووان لە گەردونێکدا مەلە ئەکەن»

بیریان چووە کە ئەیانوت زەوی تەختە

لەکاتێکدا قورئان ئەڵێ

{والارض بَعدَ ذلك دَحاها}

«زەوی ڕاخستووە»

کاتێک کە زانستەکەیان پڕ بوو لە سیحر

قورئانی ئێمە باسی شوێنی هەسارە و ئەستێرەکانی ئەکرد

ئەو ئاینەی زانستی کرد ب فەرز مەحاڵە لەدژی بوەستێتەوە چونکە وەک ئەوەی دژی خۆی بێت

بەڵام دژی ئەو زانستەیە کە دان بە بونی خودا و پاشای جیهانیان نانا

زانستێکی گەمژە کەپێی وایە هەموو ئەم گەردونە لە خۆیەوە دروست بووە تەنها لەبەر ئەوەی ڕونکردنەوەی باشتری لانیە

باشترین سەدەی زانست ئەوکاتە بوو کە بەدەست موسڵمانان بوو

چونکە زانست بەبێ ئاین ئەبێ بە ئیلحاد

و ئاین بەبێ زانست ئەبێ بە خەیال

{وَقالت امرأتُ الفِرعون قُرَّت عين لي وَلَكَ لا تَقتُلوهُ عَسى أن ينفعنا أو نتخِذهُ وَ وَلَداً وَ هُم لا يشعرون}

«خێزانەکەی فیرعەون وتی موسا مەکوژن ئەمە لە وڵاتێکی ترەوە ئاو هێناویەتی زیانی بۆ تۆ نابێت چاووی هەردوکمان ڕۆشن ئەکاتەوە ،مەیکوژن بەڵکو سودمان پێ بگەیەنێت یان بیکەین بە منداڵی خۆمآن بەڵام ئەوان هەستیان ناکرد کە تیاچوونی فیرعەون لەسەر دەستی ئەو منداڵەیە»

ئەم ئافرەتە یەکێکە لە مەزنترین مسڵمانانی مێژوو

هەرچەندە هاوسەری یەکێک لە گەورەترین کافرەکانی مێژوو بوو

یەکێکە لەو چوار ئافرەتەی کە گەشتوون بە پلەو پایەی تەواو

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم )وتویەتی:

زۆرکەس هەن لە پیاوان پلەو پایەیان تەواوە بەڵام لە ئافرەت تەنها چوار کەسن

ئەوانیش مریەمی کچی عمران و ئاسیای خێزانی فیرعەون و خەدیجەی کچی خوەیلد و فاتیمەی کچی محمد

ئەم چوار کەسە یەکێک لە باشترین پارێزەرەکانی تێدایە

پارێزەری موسا بوو

کاتێک ئاسیا وتی «لەوانەیە سودێکی بۆمان هەبێ»

موساش بوو بە کوڕی، بە پەیامبەری،ئەو کەسەی مژدەی بەهەشتی پێ دا

هیچ سودێکیش نییە لە بەهەشت زیاتر بێت

دووەم یارمەتیدەری موسا خێزانەکەی بوو کاتێک وتی باوکە بەکرێی بگرە با شوانیمان بۆ بکات هەم بەهێز و هەم ڕاستگۆیە

موساش هەم بەهێز بوو و هەم ڕاستگۆ بوو

سەیری فیرعەون بکە پێش موسا هەزاران منداڵی کوشت

چونکە پێیان وت کە مانای خەونەکەی ئەوەیە کە منداڵێک لە بەنی ئیسرائیل ئەبێتە هۆی نەمانی موڵک و دەسەڵاتی

بەڵام لەهەمان کات دلی ئاسیا نەرم بوو لە ئاست موسا

موساش لەماڵی فیرعەون گەورە بوو

هەزاران منداڵی کوشت تاکو منداڵی خاوەن خەونەکەی نەیەت بەڵام کە ئەو منداڵە هات لە ماڵی خۆی گەورەی کرد

ئەوەی خودا نوسیبی هەر ئەبێ ڕوبدات

و ئەوەی لە قەدەر نوسیبی بێ گومان ئەبێ ڕوبدات بەڵام ئەم دونیایەی کردووە بە شوێنی هۆکارەکان

وَ إذ قال موسى لِقَومهِ إن الله يأمُرُكم أن تَذبحُوا بَقَرة}

«موسا به قەومەکەی وت خودا فەرمانتان پێ ئەکات مانگایەک سەرببڕن. »

بەنو ئیسرائیل ڕۆژێک بەخەبەر هاتن و بینیان تەرمی کەسێک بەلەبەردەم ماڵێک کەوتووە

هەریەکێکیان تۆمەتیان بۆ کەسێکی تر ئەکرد

تا گەشتنە ئەوەی بچنە لای موسا بۆ دادوەری

موساش پێی وتن مانگایەک سەر ببڕن و مردوەکە بهێنن بەلای زمانیدا زیندوو ئەبێتەوە و پێتان ئەڵێ کێ کوشتویەتی و ئەمرێتەوە

لە ئایەتەکە ورد بەوە

مانگایەک،واتا دانەیەکی دیاریکراو نییە

هەر مانگایەک بێت ئەبێت

بەڵام یەهود هەر لە زووەوە پارە پەرست بوون هاتنەوە لای موسا و وتیان کەمێک وەسفیمان بۆ بکە

ئەویش وتی نە گەورە و نە بچوک

دەرکاکەی فراوان جێ هێشت بۆیان بەڵام ویستیان تەسکی بکەنەوە لە خۆیان

پرسیاری ڕەنگەکەیان کرد

موساش وتی مانگایەکی ڕەنگ زەردە

مانگایەکی زەرد نە گەورەیە و نە بچوکە

بەڵام هێشتا ڕازی نەبوون پرسیاری زیاتریان کرد

وتی مانگایەکە کە زۆر خۆشەویستە لای خاوەنەکەی لە کار کردن و کێڵگەدا بەکار نەهاتووە

ئەوانیش گەڕان بە دوای مانگایەکەی زەرد کە نە گەورەگە و نە بچوکە و خۆشەویستە لای خاوەنەکەی

یەکدانەیەکیان دۆزیەوە کە خاوەنەکەی وتی ئەبێ پڕ بە پێستی ئاڵتونم پێ بدەن چونکە زانی زۆر پێویستیانە

و ئاڵتونیان دا بە خاوەنەکەی و ئەوەیان کرد کە موسا وتی

مردووەکە هەستایەوە و وتی کە بکوژەکەی برا زاکەیەتی و تاکە کەسە کە میراتەکەی بۆ ئەمێنێتەوە ویستی بە مردنی ببێتە خاوەن پارە و سامان

وانەی یەکەم:

خودا کاتێک لە شتێک بێدەنگ ئەبێت بە ڕەحمەتی خۆیەتی نەک لەبیرچونی

ئەوەی بیەوێ تایبەتی بکات جیای ئەکاتەوە

بۆیە ئەوەی خودا بە فراوانی جێی هێشت لە خۆتانی تەسک مەکەنەوە

وانەی دووەم:

یەهودەکان زۆرترین پەیامبەریان بۆ هاتووە و کەمترین کەسیان ئیمانی هێناوە

موسا دەریای بۆ لەت کردن و تێپەڕین لێی

قاچیان وشک نەبوبۆوە وتیان خودایەکمان بۆ دانێ بیپەرستین

خودا شاخێکیان بۆ ئەکاتە سێبەر ڕازی نین

ئاڵتونی بەسەردا ئەباراندن و کفریان ئەکرد

تاڵوتیان بۆ ئەنێرێ،لە ڕێی لا ئەدەن مەگەر کەمیان نەبێ

بە کۆمەڵ پەیەمبەریان بۆ ئەنێرێ

هەندێکیان ئەکوژن هەندێکیان بە درۆزن ئەزانن

وانەی سێیەم :

ئەوەی بۆ تۆ بێت هەرچەنە لاواز بیت هەر بۆت دێت

ئەوەشی بۆ تۆ نەبێت هەرچەنە بەهێز بیت بۆت نابێ

بیریکردەوە،پلانی دانا،لەبەر پارە کەسێکی کوشت،دواتریش لێی بێبەشکرا

پارەکەش بۆ کەسانێک چوو کە چاوەڕێیان ناکرد چونکە خودا بۆی نوسیبوو

وانەی چوارەم:

پارە کۆئەکەینەوە بە حەڵاڵ و حەرام دواتریش دوای خۆمان جێی ئەهێڵین بۆ میرات دڵخۆش ئەبن پێی ئێمەش حیسابات ئەکرێین لەسەری

پارە گرنگی ژیانە بەلام هەموو ژیان نا

خودا هەموو شتێکی بە دادپەروەری دابەش کردوە بەسەر خەڵک

کەم کەس هەیە هەموو شتێکی هەبێت

دەوڵەمەندێک ئەبینی کە سەرەرای پارە زۆری نەخۆشی بێبەشی کردووە لە زۆر خواردن

هەژارێکیش ئەبینی ئەتوانێ بیخوات بەڵام نییە

یەکەم پارەی پێ دراوە،دووەم تەندروستی پێدراوە

کەسێک ئەبینی لە منداڵ بێبەشە بەڵام زانستی هەیە

کەسێکی تر منداڵی هەیە بەڵام زانستی پێویستی پێ نیە

دونیا بەم شێوەیەیە تەواوەتی نییە

بەڵام ئێمەی مرۆڤ ئەوە ئەبینین کە نیمانە نەک هەبوەکانمان

وا ئەزانێت ئەوەی نیەتی هەموو دونیا لەسەر ئەوەیە

بیرمان ئەچێت کە ئێرە شوێنی تاقیکردنەوەیە و حساباتی ئەوانەمان لێ ناکرێ کە بێ بەشین لێی

بەڵکو پرسیارمان لێ ئەکرێ کە چیمان کرد بەوەی پێمان درا

نهێنی دڵخۆشی ڕازی بوونە

ئەگەر تەماشای ئەوەمان بکردایە کە هەمانە

کاتمان نابوو بۆ حەسرەتی ئەوەی کە نیمانە

بەڵام مرۆڤ هەمووکات وایە بیری ئەوەی نییە کە لە دەستی
خۆیدایە تەنها سەیری ئەوە ئەکات کە لە دەستی کەسانی ترە

ماڵەکان نەهێنین تۆ چوزانی ئەوەی پارەی زۆری هەیە چۆن ئەژی

تۆ چوزانی ئەوەی هاوسەرێکی جوانی هەیە دڵخۆشە

دڵخۆشی بەوە نییە کە هەمانە بەڵکو بە هونەری بەکارهێنانیەتی

{فأوجَسَ في نَفسهِ خِيفةِ مُوسى قُلنا لا تَخَف إِنَّكَ أنتَ الأعَلَىٰ }

«.موسا لە دڵی خۆیدا ترسا وەکو هور مرۆڤێکی ئاسایی خوای گەورە پێی فەرموو ئەی موسا مەترسە هەر تۆ سەرکەوتووی و ئەیبەیتەوە»

بوێری ئەوەیە نییە کە نەترسی

بەڵام ئەبێ بزانی کە چۆن ترسەکەت بشاریتەوە

پێویستە لەبیر نەکەین کە خەڵکی هەرچەند بەرز ببنەوە لەکۆتایدا هێشتا هەر مرۆڤە

ئەمە موسایە ئەترسێ

ئەمە نوحە دڵی پارچە پارچە ئەبێ بۆ کوڕەکەی کە کافرە و ئەڵێ ئەوە لە خێزانی منە

ئەمە ئیبراهیمە کاتێک خەونەکەی بۆ کوڕەکەی باس ئەکات و ئەڵێت کوڕی خۆم

و کاتێک فریشتەکان لەشێوەی مرۆڤ هاتنە لای و دەستیان بۆ خواردن نەبرد ترسا،ئەوانیش دڵنیایان کرد

وکاتێک وتیان ئەچین قەومێکی ستەمکار لەناو ئەبەین بیری لە کەسە نزیکەکانی کردەوە و وتی لوط لەوێیە

و یەعقوب کە دڵی بەرگەی دوری کوڕەکەی ناگرت و وتی پێم ناخۆشە لەگەڵ خۆتان ئەیبەن

و محمد(صلى الله عليه وسلم)ئەگری لە ڕۆژی مردنی کوڕەکەی و ئەڵێت دڵ خەمبار ئەبێت چاوەکانیش فرمێسک ئەڕێژن و ئێمە بۆ دابڕانی تۆ دڵتەنگین ئەی ئیبراهیم بەڵام هەرچی خودا پێی ڕازی بێت ئێمە ئەوە ئەڵێین

مرۆڤەکان هەرچەند پلەو پایەی هەبێت هێشتا مرۆڤێکی ئاسایین

تەنها ئەوەنەیە ئارامگر بوون

بەڵام ئەمە واتای ئەوە نییە کە وەکو ئێمە مرۆڤ نین

خۆشیانئەوێ و ڕقیان هەیە توڕە ئەبن و ڕازی ئەبن ئارەزوو و ئاواتیان هەیە

کەسێکی سواڵکەر وەکو چۆن بە پارە دڵخۆش ئەبێ بەهەمان شێوە بە قسەیەکی جوانیش دڵی خۆش ئەبێ چونکە مرۆڤە

خزمەتکاری ماڵ بە هەڵسوکەوتی جوان لەگەڵی دڵخۆش ئەبێت چونکە هێشتا مرۆڤە

کارگوزارەکان بە بزەخەندەیەک دڵخۆش ئەبن چونکە مرۆڤە و زەردەخەنەیەک بەڕوی کەسێکدا لەوەیە هەموو ڕۆژەکەی لا جوان بکات چونکە هەموو مرۆڤەکان

بەخشندەکان و ڕەزیلەکان

دەوڵەمەندەکان و هەژارەکان

پیاو و ئافرەتیان

هەرچەندە ڕۆڵیان جیاواز بێت لە ژیان هەر مرۆڤن

کەسە باشەکان تەنها خێرخوازێک نین لەسەر زەوی

کرێکارەکانیش تەنها ڕۆبۆتێک نین لە گۆشت و خوێن

ئەوانیش مرۆڤن

{فما كانَ جَوابُ قَومِهِ إلا أن قالوا اخرِجوا آل لوطٍ مِن قَريَتِكُم إنَّهُم أناسٌ يَتَطَهرون}

«وەڵامی قەومی لوط تەنها ئەمە بوو

لوط و شوێنکەوتوانی شاربەدەر بکەن چونکە ئەمانە کەسانێکن خۆیان پاک ڕائەگرن »

ئەمە حاڵی کۆمەڵگا خراپەکانە لە هەزاران ساڵەوە

ئەگەر تاوانێکی بلە کەسە باشەکان نەدۆزیەوە تاکو عەیبداری بکات ئەوا بە جوانترین شتیان عەیبداری ئەکەن

تاوانی شوێنکەوتوانی لوط پاکیان بوو

هەندێک شت لەسەر ئەم هەسارەیە ناگۆڕدرێ

خەڵکە خراپەکان هەست بە خنکان ئەکەن بە کەسە باشەکان چونکە کەم و کوڕی خۆیان بیردێننەوە

هەر لەبەر ئەمە زیناکار حەز ئەکات هەموو ئافرەتانی دونیا زیناکار بن

و دز حەز ئەکات هەموو خەڵک دز بن

و ڕیبا کار حەز ئەکات هەموو کەسەکان ڕیاباکار بن

چونکە خۆیان ناتوانن بگەن بە ئاستی ئەوانی تر

ئەیانەوێ خەڵکی دابەزێتە ئاستی ئەوان

ئەوان لە نێوان خۆیان بە خراپە باسی ئێوە ئەکەن بەڵام لەناخەوە ئاواتە خوازن کە وەک ئێوە بان

باوەڕیان پێ مەکەن کاتێک ئەڵێن

حیجابەکان ئاڵۆزن

خواپەرستەکان جدین

ڕاستگۆ ئەتەکێت نازانێت

لەناخی خۆیاندا ڕێزت لێ ئەگرن ئەگەر هەرچی بڵێن

ئێوەش مەگۆڕێن

{أنا أكثرُ مِنكَ مالاً}

«من ماڵ و سامان و پارەم لە تۆ زیاترە»

خودا ماڵی دونیا ئەدا بە کەسانێک کە خۆشیئەوێن و کەسانێک کە ڕقی لێیانە

بەڵام ئایین تەنها ئەدات بەو کەسانەی خۆشەویستن لای

هەموو دونیای دا بە پێغەمبەر سولەیمان و زولقەرنەین

دای بە قارون و نەمرودیش

ئەگەر پێوەرێک هەبووایە بۆ جیاکردنەوە لێرە پێغەمبەر و ستەمکار لەهەمان پلە ئەبوون

هەژارترین کەسەکان ئەوانەن کە تەنها پارەیان هەیە

وا ئەزانن هەمووشتێک ئەتتوانێ بکڕدرێ تەنانەت بەهەشتیش

وا ئەزانن دەوڵەمەندی ئەو دونیاشن تەنها لەبەر ئەوەی پارەی ئەم دونیایان هەیە

پارە ئاسانکارییە بۆ ژیان بەڵام هەر خۆی ژیان نییە

ڕێگەیەکە نەک مەبەستێک

ئەگەر بیخەیتە ژێر پێیەکانت بەرز ئەبیتەوە

ئەگەریش بیخەیتە سەر سەرت نزم ئەبیتەوە

هەبوونی پارە بە هەوڵی قەرز نابیت

پارەی حەڵاڵ نیعمەتە لەدەستی کەسی چاک

گرنگ ئەوەیی پارە لە دەستت بێت نەک لە دڵت

پارە ژیان ئاسانتر و خۆشتر ئەکات

بەڵام جوانترین شتەکانی دونیا بە پارە ناکڕدرێن

پارە دەرمان ئەکڕێت بەڵام تەندروستی نا

جێگەی خەوتن ئەکڕێت بەڵام خەو نا

دیوانێکی شیعری ئەکڕێت بەڵام خۆشەویستی نا

جەستەیەک ئەکڕێت بەڵام خۆشەویست نا

کتێبێکی پێکەنیناوی ئەکڕێت بەڵام پێکەنێک لەدڵەوە نا

دایەنگەیەکی مناڵان ئەکڕێت بەڵام منداڵ نا

کتێبخانەیەک ئەکڕێت بەڵام ڕۆشنیری نا

ئۆتۆمبێلێک ئەکڕێت بەڵام قاچ نا

چاویلکە ئەکڕێت بەڵام چاو نا

کەسانی چواردەورت ئەکڕێت بەڵام هاوڕێ نا

هەژار و دەوڵەمەند لەتوانای سکی خۆی زیاتر ناخوات

و تەنها یەک جل لەبەر ئەکات با مارکەکەشی جیاواز بێت

هەرچەند پێڵاوی هەبێت تەنها یەک دانە لەپێ ئەکات

پارە کۆبکەنەوە تا خزمەتتان بکات نەک خزمەتی بکەن

بیکەن بە بەردەیەک لای خۆتان نەک سەرۆکتان

شوێنکەوتووتان نەک شوێنی بکەون

ژیانتان ئاسان بکەن پێی بەڵام مەیکەن بە ژیانتان

هەمووکات بیرت بێت زۆر شتت هەیە کە ناکڕدرێن

{وَكَلبُهُم باسِطٌ ذِراعيهِ بالوَصيد}

«سەگەیان لەبەردەم دەرکاکە هەردوو دەستی شۆڕ کردۆتەوە»

سەگێک باسکراوە کە قورئاندا چونکە هاوڕێیەتی پیاوچاکانی کرد

هەر بۆیە هاوڕێکانی باش هەڵبژێرە هەر وەک چۆن جلەکانی هەڵئەبژێری

کاتێک خەریکیت هاوڕێیەکی خراپ باش ئەکەیت کەچی ئەو تۆ خراپ ئەکات

ئەگەر خراپیشت نەکا ئەوەنە خراپیەی بەسە بۆت کە هاوڕێیەتیت کرد

چونکە مرۆڤ لای خەڵک لەسەر ئایینی هاوڕێکەیەتی

عەرەب ئەڵێ پێش هەڵبژاردنی ڕێگەکەی هاوڕێکەت هەڵبژێرە

دراوسێکەت پێش ماڵەکەت هەڵبژێرە

هاوڕێی چاک یەکێکە لە خۆشیەکانی ژیان

بیرێکی قوڵ کە نهێنیەکەتی لێ دائەنێی

مێشکێکی پێگەشتوو کە کارەکانتی لەگەڵ بەش ئەکەیت

شانێکی میهرەبان کە سەری لەسەر دائەنێی

دەستێکی میهرەبان ماندویەتیت لائەبات

سەگێک تا هەتایە باس ئەکرێ چونکەی هاوڕێیەتی پیاوچاکانی کرد

مێرولەیەک هەتاهەتای باس ئەکرێ بەهۆی زەردەخەنەی سولەیمان بۆی

هود هودێک هەتا هەتای باس ئەکرێ چونکە نامە بەر بو

وَعاشِرُهُون بِالمَعروف}

چاکە وشەیەکە لە هەموو کارێکی باشدا هەیە

زەردەخەنت بە ڕوویدا چاکەیە

وشەیەکی جوان چاکەیە

لەباوەشکردنی چاکەیە

دیارییەکی گونجاو چاکەیە

گوێگرتن لە سکاڵای چاکەیە

گرنگیدان بە تەندروستی چاکەیە

دورنەخستنەوەی لە خێزانەکەی چاکەیە

ڕێزگرتن لە بیرو بۆچوونی چاکەیە

ڕێزگرتن لەحەز و ئارەزووەکانی چاکەیە

یارمەتیدانی لەکاری ماڵەوە و منداڵ چاکەیە

یارمەتیدانی لەکاری ئایینەکەی چاکەیە

بەرگەگرتنی هەڵەکانی چاکەیە

میهرەبانیت بۆی چاکەیە

گرنگی پێ بدەی لەکاتی نەخۆشی چاکەیە

بەرگەی گۆڕینی میزاجی بگری چاکەیە

میهرەبانی پیاو ئەکوژن بەناوەی بەهێزی کەسایەتی

وای لێ ئەکەن ڕەق بێت بەناوەی پاراستنی پیاوەتی

وای لێ ئەکەن ڕەق و توند بێت بەناوەی ئەوی فلان کەس کۆنتڕۆڵی ماڵی خۆی ئەکا

هەندێک هەڵسوکەوتمان تەنها نەخۆشیەکی دەرونیە کە ئاڵۆز بووە بەهۆی زۆری کات بەسەریدا و بووەتە خوو لامان

پیاوەتی ئەوە نییە خەڵکی چی کرد تۆش ئەوە بکەی

بەڵکو ئەوە بکەیت کە پێت ڕاستە

پێشەوای مرۆڤایەتی(صلی الله علیه وسلم)

لە خزمەتی ماڵی خۆیدا بوو

و زۆرترین پێکەنین و ڕووخۆشی بۆ ئەوان بوو

لای شەرم نەبوو باسی خۆشەویستی خێزانەکەی بکات و ئەیوت خۆشەویستی خەدیجە ڕسقێک بوو پێمدرا

کۆتا وەسێتیشی وتی ئافرەتان ئامانەتی ئێوەن

{وَبدأ خَلْقَ الإنسان مِن طين}

«سەرەتا ئادەم لە قوڕ دروستکرا»

خودا ئادەمی لە قوڕ دروست کرد

حەوای لە پەراسووی ئادەم دروست کرد

ئەگەر حەوا بەشێک بێت لە ئادەم

ئەوا ئادەم بە تەواوی حەوا بوو

هەرکات پیاو ئافرەتێکی خۆشویست ئەیکات بە بەشێک لە ژیانی

لەسەرەتاوە وا بووە ،بەشێک لە بونی

بەڵام ئافرەت کاتێک پیاوێکی خۆشویست ئەیکات بە هەموو ژیانی
هەروەکو سەرەتا هەموو بوونی

ئافرەت ڕاستگۆترە لە خۆشەویستی وەک لە پیاو

ئەمە بە خراپ باسکردنی پیاو نییە

و بەباشە باسکردنی ئافرەت نییە

ئەمە سروشتێکە خودا دایناوە تاکو ژیان زیاتر بەردەوام بێت

خودا ئادەمی کە خۆڵ دروست کرد

خۆڵێش ئەو شوێنەیە کە دار و درەخت لێی گەشە ئەکات

هەر بۆیە نرخی پیاو لەگەڵ کارکردن و بەرهەمەکانیەتی

بەڵام حەوای لە پەراسوویەکی نزیک دڵی ئادەم دروست کرد

هەر لەبەر ئەمە نرخی ئافرەت بە تەواوی لە بەرهەمدا نییە

و کاتێک بەرهەمێکی ئەبێ ئەوە هەموو بوونی نییە

بەڵکو بەشێکە لە بوونی

بەڵام بە تەواوی خۆی لە خۆشەویستیدا ئەدۆزێتەوە

چونکە لە پارچەیەک دروست بووە نزیک دڵ

ئافرەت هاوسەرێک و دایکێکی میهرەبانی لێ دەرئەچێت

هەر لەبەر ئەمەیە ئافرەت زیاتر حەز ئەکات ببێت بە دایک بە بەراورد بەپیاو کە حەز ئەکات ببێت بە باوک

چونکە باوکایەتی زنجیرەیەکە لە زنجیرە زۆرەکانی بەرهەمی پیاو

بەڵام دایکایەتی جوانترین بەشی خۆشەویستیە

بەبێ ئەوە ئافرەت هەست بە کەم و کوڕی ئەکات لە ڕووی هەستەوە

چونکە ئەمە کێشەیەک دروست ئەکات لەو کارە گەورەیەی کە بۆی دروست کراوە

هەر لەبەر ئەمە پیاو کێشەی نییە ئەگەر ئافرەت یارمەتیدەری بێت لە ژیانی ماددی بەڵام بەو مەرجەی کاری ئەو نەبات

بەڵام پێیی شەرمە ئافرەتک کار بۆ ئەو بکات

چونکە بونەوەرێکە لەخۆڵ

بەڵام ئافرەت کای ئاساییە بەرپرسیارێتی لەسەر پیاو بێت

پیاو ژیانی ماددی بۆ دابین بکات

هەرگیزیش هەست بە کەم و کوڕی ناکات

چونکە بونەوەرێکە لە دڵ دروست بووە

ئافرەت ئەبێ نرخی بەرهەمەکانی پیاو بزانێت هەرچەند کەم بێت

چونکە بەم شێوەیە یارمەتیدەر بۆ کاری پیاو

و پیاویش ئەبێ دڵی نەرم بێت لە ئاست ئافرەت و نازی هەڵبگرێ
و خانمی بسەلمێنێ

{تِلكَ الدارُ الآخِرة نَجعَلُها للذين لا يُريدون عُلَّوا في الأرض وَلا فَساداً والعاقِبة للمُتَقينَ}

«بەهەشتمان بۆ کەسانێک داناوە کە خۆیان بە گەورە نازانن لەسەر زەوی لوت بەرز نین و ئاشوب ناگێڕن وماڵی خەڵک بە ناهەق ناخۆن سەئەنجامیش هەر ئەوان تەقوای خوا ئەکەن»

چووە ئاسمانی حەوتەم و دابەزیەوە سەر زەوی

خۆی نەعلەکانی پاک ئەکاتەوە ،ئاژەڵەکانی ئەدۆشێ

لەگەڵ هەژاران نان ئەخوا

کەسە مەزنەکان بەم شێوەیەن هەرچەن بەرز ببنەوە هێشتا خۆ بە کەم زانن

لەگەڵ هاوەڵانی ئەچنە دەرەوە و بڕیار ئەدەن ئاژەڵێک سەرببڕن

یەکێک ئەڵێت:من سەری ئەبڕم

یەکێکی تر ئەڵێ:من کەوڵی ئەکەم

یەکێکی تر ئەڵێ :من وردی ئەکەم

ئەویش ئەڵێ منیش ئەچم دار کۆ ئەکەمەوە

کەسە مەزنەکان بەم شێوەیەن حەز ناکەن جیابکرێنەوە لە خەڵکی

لەماڵی موسڵمانان پارەی زۆر هەیە

هەمووی بەسەر خەڵک دابەش ئەکات و خۆی لەبیر ئەکات

ئەمرێت و قەڵغانەکەی لای یەهودیەک ئەبێ

خەڵکی نوێژ ئەکەن ئەویش لە سوجدەدا حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ئەچێتە سەر پشتی هەڵناسێتەوە تاکو کچەزاکەی لائەچێت

دوبارە نوێژ ئەکات و گوێی لە دەنگی گریانی منداڵێک لە ڕیزی ژنان

نوێژەکەی کورت ئەکاتەوە و ئایەتی کورت ئەخوێنێ

بۆ ئەوەی دڵی دایکی لەسەر منداڵەکەی نەبێت

کەسە مەزنەکان بەم شێوەیەن هەن بۆ ئەوەی ڕەحم بە خەڵکی تر بکەن

ناهێڵێ هاوەڵانی وەکو ڕێزێک هەستن بۆی

جارێک ئەچێتە لای هاوەڵانی و بێ ویستی خۆیان هەڵدەستن

حسان ئەبینێ کە لایٔ ناخۆش بووە و ئەڵێ

هەستانم بۆ بەڕێزێک ئەرکە

و ئەرکیش ئەبێ جێبەجێ بکرێ

پێم سەیرە ئەوەی مێشکێکی هەبێ و تێبگات

چۆن ئەم جوانییە ئەبینێ و هەڵناستێ

پێغەمبەریش بزەیەک ئەکات و ئاشت ئەبێتەوە

کەسە مەزنەکان بەم شێوەیەن کاتێک داوای لێ بوردنی لێ بکرێ قبوڵی ئەکات

ئاساییە مرۆڤ بۆ ژیانی دونیای کار بکات

بەڵام بەو مەرجەی ژیانی ئەو دونیای بیر نەچێ

ئاساییە ماڵەکەی جوان بکات بەڵام بێ ئەوەی گۆڕەکەی بیربچێت

{وما يَعلَمُ جُنودُ رَبكَ إلا هو}

« هیچ کەس ئاگادار و زانا نیە لەبارەی سەربازەکانی خودا جگە لە خۆی»

تۆڵەی نوحی بە ئاو کردەوە

بەئاگر ڕاستگۆیی ئیبراهیمی سەلماند

بە نەهەنگ یونسی پاراست

بە بۆق و پیسی و خوێن موسای پاراست

بە جاڵجاڵۆکە محمدی شاردەوە

بە دەریا فیرعەونی نوقوم کرد

بە مێشولە نەمرودی ڕسوا کرد

بە مشک بەنداوی ماربی شکاند

لە زەویدا

لە زەویدا مێروو هەیە کە بەچاو نابینرێن هێندە بچوکن کەچی کاغەزی فەرمانەکانی قوڕەیشیان لە ناو برد کە باسی کە دەرکردنی محەمەد ئەکرد

لەبەر دەرکای مەککە فیل لە حەبەشە هەڵگەڕایەوە

ڕێگەیان چۆڵکرد لە نێوان ئەبرەهە و ماڵی خودا

عبدلموتەڵیب لە دورەوە وەستا بە شمشێرەکەی دەستی و بەناوبانگترین دوعا

خودایە بەندەکەیەکت ڕێگری لە گەشتێک ئەکا،تۆش ڕێگری لە گەشتەکەی بکە

نەگەن بە ئاوات و ویستی خۆیان مەگەر تۆ بتەوێ

ئەگەر وازیان لێ ئەهێنی و ئێمە قبوڵی بکەین ئەوە لە دەستی خۆتدایە

خوداش قبوڵی کرد و ئەبابیلی نارد

خودای گەورە بە گەورەی خۆی ئاو و ئاگر و مێشولە و بۆق و نەهەنگ مێرووەکان و مشک و ئەبابیلی کردووە بە سەرباز

هەموو ئەم گەردونە سوپای ئەون

هەموو ئەوەی لەسەریشی ئەژی سەربازی ئەون

دەهۆڵی جەنگ لێ ئەدات بە لاوازترین دروستکراوەکانی بەرامبەر دوژمنانی لە مەزنی و گەورەی خۆیدا بە هەرچی بڵێ ببە ئەبێت

{قالت فَذٰلكُنَ الذي لُمْتنني فيهِ وَلَقد رَاودتهُ عَن نفسهِ فاستعصم وَلئن لَم يَفعَل ما آمرهُ لِيُسجَن ولِيكونا مِن الصاغرين}

«دانی پێدا ئەنێم کە من داوام لێ کرد بێت کاری خراپە بکات بەڵام ئەو خۆی پاراست و نەیکرد و دوبارە داوای ئەوەی لێ ئەکەم ئەگەر ئەنجامی نەدات ئەبێ بیخەمە بەندینخانە ئەبێ زەلیل و ڕسوا ببێت لەوێدا»

دوو ئافرەتی خەڵکی میسر کە دوو پێغەمبەر لە ماڵەکەیان گەورە بووە

یەکەم زوڵەیخا بوو هاوسەری عەزیزی مسر

یوسف لە کۆشکەکەی ئەو گەورە بوو

دووەم ئاسیای خێزانی فیرعەو. موسا لە کۆشکەکەی گەورە بوو

هەردوکیان خاوەنی پلە و پایە و سامان و ڕێز بوون

بەڵام لە ئیمان و خودا پەرستی و چاکە دووربوون

زوڵەیخای هاوسەری عەزیزی مسر کە هاوسەرەکەی دووەم پیاوی دەوڵەت بوو بەپێی سیستمی فیرعەونەکان

ئاسیای هاوسەری فیرعەونیش هاوسەرەکەی یەکەم پیاوی دەوڵەت بوو بەپێی سیستمی سیاسی میسری کۆن و بەپێی سیستمی ئاینی ئەوان خودا بوو

واتە ئاسیا لە پلەو پایەدا زۆر لە پێش زوڵەیخا بووە با سەردەمەکەشیان جیاواز بووبێت

چونکە یوسف سەدان ساڵ پێش موسا هاتووە بە هەمان شێوە زوڵەیخاش پێش ئاسیا

هەردوکیان پێغەمبەرێکیان لەماڵەکەی خۆیاندا گەورە کرد لەو کاتەوەی نینۆکەکانیان هێشتا نەرم بوو تاکو بوون بە پیاوێکی تەواو

زوڵەیخا یوسفی گەورە کرد پێش تەمەنی ١٠ ساڵی دوای ئەوەی عەزیزی میسر کڕی و بۆی کرد بە دیاری

ئاسیاش موسای لە یەکەم ڕۆژی لەدایک بوونیەوە گەورە کرد دوای ئەوەی خودا بەدایکی وت بیخاتە ئاوەکەوە

زوڵەیخا شەهوەتی پێش دایکایەتی خست یوسفی بە شێوەیەک ویست وەک چۆن هاوسەرێکی ئەویست

ئاسیاش هەستی دایکایەتی بەسەر هەستی دوژمنداری زاڵ بوو

موسای وەکو مندڵی خۆی ویست

گرنگی پێ بدات و وەکو چاوی ئاگاداری بێت و بە میهرەبانی دڵی لە باوەشی بگرێت

زوڵەیخا یوسفی کردە زیندانەوە

ئاسیاش ڕێگەی نەدا موسا بکوژرێ

زوڵەیخا ژیانی دونیای ویست

ئاسیا ژیانی کۆتای ویست

زوڵەیخا تەنها کاتێک باوەڕی بە یوسف هێنا کە تەمەنی گەورە بووبوو

بوو بە پیرەژنێکی زەلیل دوای لەدەسدانی هاوسەرەکەی دواتر ڕێز و پارەکانی و چاوەکانیشی لەدەست دا

ئاسیا لە یەکەم ڕۆژەوە کە موسا داوای گەڕانەوەی لێکرد بۆ لای خودا باوەڕی پێ هینا

زوڵەیخا بەهۆی حەز و ئارەزوویەوە لە هاوسەرەکەی دابڕا

ئاسیاش بەهۆی ئیمانەکەی لە هاوسەرەکەی دابڕا

زوڵەیخا هاوسەرەکەی مرد و هێشتا لێی توڕە بوو

ئاسیاش مرد و خودا لێی ڕازی بوو

بڕوای وابوو کە ڕێزی ڕاستەقینە ڕێزی ئەو دنیایە بۆیە ئەیوت

{رَبِ ابنِ لي عِندَك بيتاً في الجَنة}

«خودایە لای خۆت لە بەهەشتماڵێکم بۆ دروست بکە»

کاتێک فیرعەون بەمەی زانی لەسێدارەی دا

لەکاتی مردندا و لەکاتی ڕوحکێشان زەردەخەنەی ئەکرد چونکە ماڵەکەی خۆی ئەبینی لە بەهەشت

پارە مرۆڤ تێکنادات

و هەژاریش چاکی ناکاتەوە

گرنگ نییە مرۆڤ لەگەڵ کێ ئەژی بەڵکو چۆن ئەژی

ئەو ژنەی هاوسەرەکەی ئەیوت

{أنا رَبُكُم الأعلى}

« من خودای مەزنی ئێوەم»

بەیانیان و ئێواران سوجدەی ئەبرد و ئەیوت پاک و بێگەردی بۆ خودای مەزن

گرنگ نییە مرۆڤ لە کوێ ئەژی بەڵکو چۆن ئەژی

ئاسیا لە کۆشکدا ئەژیا بەڵام دڵی بەسترابوو بەماڵێک لە بەهەشت

{هُو الذي يُصَورُكُم في الأرحامِ كَيف يشاء}

«خوای گەورە ئەو خودایەیە کە وێنەی ئێوە ئەکێشێ لەناو ڕەحمی دایکتاندا هەرچۆنێک ویستی لێ بێت »

خودا جوانی لەنێوان خەڵکی دابەش کردووە وەک چۆن ڕسقی دابەش کردووە

ئەوەی دەوڵەمەندی کردبێ لە چاکەی خۆیەتی

و ئەوەی هەژاری کردبێ لە هەژاری خۆی نییە

بەڵام هەموو شتێک ڕادەیەکی هەیە لەلای

بە هەمان شێوە جوانیش

ئەوەی بەجوانی دروستی کرد،ئەوە تەنها دڵۆپێکە لە دەریای داهێنانەکانی

و ئەوەی کەمتر جوانی پێ درا بێت بەهۆی بێ توانای خودا نیە بەڵکو هەموو شتێک ڕادەی هەیە لای خودا

ئەگەر جوانیەکەی خۆت فریوی دای بیرت بێت ڕۆژێک کەسێک لەم سەر زەوییە ژیاوە کە جوانی خەیاڵی هەبووە

بەڕادەیەک جوان بووە کە ئافرەتان لەکاتی سەیر کردنیدا دەستی خۆیان بڕیوە

ئەگەر تەنها زولەیخا دەستی ببڕیایە ئەوە تەنها ئافرەتێک بوو کە ئاشقی پیاوێک بووە

و هەموو کات جوانی ڕێژەیی بووە

ئەوەی تۆ پێت جوانە،لەوەیە کەسێکی تر لای ئاسایی بێت

بەڵام ئەوەی هەموو ئافرەتانی ئەو شوێنە دەستی خۆیان ببڕن بێ ئەوەی هەست بکەن ئەمە واتا جوانی یوسف لە ڕێژەیەکی بەرز بووە

هێندە سەرنجڕاکێش بوو بووە هۆی فیتنە لە نێوانیان

هێندە جوان بوو سەر ئەسوڕما لە ئاستی

بەڕادەیەک ڕێکپۆش بوو کە گومان ە مرۆڤبوونی ئەکرا

{ما هذا بَشَراً}

« ئەمە چییە مرۆڤە»

ئەی ئەم جوانە سەرنجڕاکێشە چی کرد؟

جوانیەکەی لە ڕەوشتیدا بوو پێش ڕوخساری

جوانی دڵی بوو پێش جەستەی

کاتێک لە زیندان بوو داوایان لێ ئەکرد مانای خەونیان بۆ لێک بداتەوە چونکە ئەیانزانی لە پیاوچاکانە

و کاتێک عەزیزی میسر بوو داوای چاکەیان لێ ئەکرد چونکە ئەیانزانی ئەهلی چاکەیە

پلەوپایە نەیگۆڕی،خۆی بە کێڵگەکاندا ئەڕۆشت و سەرپەرشتی ئەکردن

شوێنی هەڵگرتنی گەنمی دروست کرد،بۆ ئەوەی بەرهەمەکان بۆ خەڵکی کۆبکاتەوە

بەرپرسیارییەتی ئەوەی خستە سەر شانی کە خواردنی ئومەتێک بدات ماوەی حەوت ساڵ وشکە ساڵی

ئەمە جوانی ڕاستەقینەیە

بە ڕەحمەتی خۆی جوانی بەڕێزە داناوە لای خەڵکی

هەرکەس هەرچەن جوانیەکی کەمی هەبێت کەسێک هەر هەیە پێی جوانە

پیاوێک ئافرەتێک بە جوانترین کەسی سە زەوی ئەزانێت لە کاتێکدا لای کەسانی تر جوانیەکەی ئاساییە

و پیاوێک لە چاوی ئافرەتکیدا لەوپەڕی جوانی و پیاوەتییە بەڵام لای کەسانی تر ئاساییە

{وَلَقد نَعلمُ انك يَضيقُ صَدرُكَ بِما يقولون}

«ئێمە ئەزانین کە بە قسەکانیان دڵت تەنگ ئەبێت»

مرۆڤەکان بە قسەیەکی ناخۆش ئازار ئەچێژن

وەک چۆن بە لێدانی شمشێرێک ئازار ئەچێژن

و قسەیەکی خۆش دڵخۆشیان ئەکات

وەک چۆن دیارییەک دڵخۆشیان ئەکات

لالایەن خوداوە ئایەتی بۆ دائەبەزی

جبریل هات و لە مەککەوە بردی بۆ قودس

تا پێشنوێژی هەموو پێغەمبەران بکات و ببێتە سەرداری مرۆڤایەتی

دواتر بەرز بۆوە بۆ ئاسمان ئاسمان ئاسمان

بەرزترین سنورەکانی ئاسمان

شوێنێکی هەبوو کە نە هیچ پێغەمەبەرێک و نە هیچ پاشایەک نەیبووە

خودا کانیاوی کەوسەری پێداوە

و سەدەیک بە ناوی ئەوەوە

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا وشەیەکی ناشرین ئازاری ئەدا و دڵی تەنگ ئەکرد

ئەی ئێمە چین بەبێ ئەو

هەموو قسەکردنێک دوو ڕێڕەوی هەیە

١.قسەکردن

٢.هەڵسوکەوت

ئەگەر قسەکردنێکی جوانت هەبوو بە ڕەفتاری ناشرین تێکی مەدە

و بیرت بێت ئەو کەسەی ئەیوت من خوای ئێوەم ، خودا پێغەمبەرێکی بۆ نارد تا بە قسەی نەرم بانگێشتی خوداپەرستی بکات

و ئەگەریش قسەت ناخۆش بوو با دوو ناشرینی تێتدا کۆنەبێتەوە

ناشرینی قسەکردن و ناشرینی هەڵسوکەوت

قسەکانت تام بکە پێش ئەوەی بە خەڵکی بڵێی

ئەگەر لە دەمی خۆتدا شیرین بوو

ئەوە لەبەر گوێی خەڵکیش وایە

و ئەگەر تاڵ بوو لە گوێی خەڵکیشدا هەر تاڵە

هەر بۆیە ناتوانی نیازی جوان بە کردەوەی ناشرین بکەیت پێویستە هەڵسوکەتت شایەنی نیازەکانت بێت

هیچ ڕاستی و هەقێک گەورەتر نییە لە پەیامی پێغەمبەرایەتی لەگەڵ ئەوەشدا خودا پێی وت

{وَلَو كُنت فَظاً غَليظ القلب لانَفضوا مِن حَولِكَ}

«ئەگەر تۆ کەسێکی قسەخراپ و ڕەوشت خراپ و ڕەق و وشک و دڵڕەق بویتایە ئەوە لە دەورت دورئەکەوتنەوە»

{إن المُنافِقين في الدَركِ الأسفل مِن النار وَلن تَجِدَ لَهُم نَصيراً}

«بەدڵنیایەوە دووڕووکان لە خوارترین شوێنی دۆزەخ دان و کەسیش پشتیوانیان نابێ و ڕزگاریان ناکا»

کفرکردنی ڕاستەوخۆ زۆر باشترە لە ئیمانێکی درۆزنانە و لە هەموو خراپەیەکدا

ئەگەر دووڕووی لە خراپتر نەبوایە لە کفر ئەوە خودا بە نزمترین شوێنی دۆزەخ و سەختترین سزا سزای نادان

عەرەبەکانی مەککە دوڕویان نەزانیوە و نەیان کردووە

بەڕای من ئەمە ئەگەڕێتەوە بۆ دووهۆکار

یەکەم:قوڕەیشکەکان ڕاست و ڕاستگۆبوون،باشترین قسەکەری عەرەب بوون و باشترینیان بوون لە کردەوەدا و بەرزترین پلەیان هەبوو و ڕەگەزی عەرەبی بە گشتی ترسیان نەزانیوە

دووڕوی لە مەدینە دەرکەوت بەهۆی زۆری خەڵک و دابونەریتی جیاواز و جیاوازی بۆچوونە سیاسییەکان

مەدینە کۆمەڵگایەکی کراوە بوو بۆ مشتومڕ و هەوڵدان بۆ سەلماندنی خود

ئەوس و خەرزەج و یەهود و نەسارا بە ڕادەیەکی تەسک لێک نزیک بوون

ئەمەش بووە هۆی سیاسەتێکی زۆر بەربڵاو

سیاسەتیش جۆرێکە لە هونەری دووڕووی.

قوڕەیش ئەمەی نازانی،چونکە سیاسەتێکی جێگیری هەبوو و پلەو پایەی بە پێی شایستەیی دابەش ئەکرد هەر بۆیە هەرگیز دانابڕان.

هۆکارە دووەم:

بەڕای من وەکو ڕای یەکەم گرنگە

ئیسلام لە مەککە لاواز بوو

دەسەڵاتی سیاسی و دارای لای قوڕەیش بوو

بەڵام لە مەدینە پێچەوانە بوو

هەربۆیە هەرکەسێک دوو هەڵبژاردەی هەبوو:

یان بێباوەڕی خۆی دەربخات و پێچەوانەی هەمووان بێت

یانیش بە درۆ خۆی موسڵمان دەرخات کە ئەمە خراپترین بوو

لە ترسی ئەوەی ئەگەر دژ بە دەسەڵات بێت ئەوە ئەدۆڕێت بۆیە ئەیویست بە درۆ خۆی بپارێزێ

چونکە مرۆڤ تەنها لەکاتی ترسا پێچەوانەی ویستی خۆی نیشان ئەدات

{واذ أخذ رَبَكَ مِن بَني آدم مِن ظَهُورِهِم ذُريَتَهُم و أشَدَهُم عَلَىٰ أنفُسِهِم ألستَ بِـَرَبُكَم قالوا بَلى شَهِدنا أن تَقولوا يَومَ القيامةِ إنَّا مُنَّا عَن هَذا غافِلين }

«پەروەردگار کاتێک ئادەمی دروست کرد هەرچی نەوەی ئادەم هەیە تا ڕۆژی قیامەت هەمووی لە پشتی ئادەم دەرکرد

کردی بەشایەت بەسەر نەفسی خۆیانەوە

پێیانی وت ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم

هەموو نەوەی ئادەم وتیان بەڵێ شایەتی ئەدەین تۆ پەروەردگاری ئێمەیت

پەروەردگاریش ئەڵی لە ئێستاوە پێتان ئەڵێم تا ڕۆژی قیامەت نەڵێن ئێمە نەمانزانی و بێ ئاگا بووین»

ئەوەی من بینیم و خوێندمەوە و گوێم لێ بووە و لێکۆڵینەوەم بۆ کردوە ئەبینم مێژووی مرۆڤایەتی دە پلەی هەبووە:

١.نەبوون:ئەوکاتەی هەموو گەردون یەکسان بوو و تەنها خودا بوونی هەبوو

٢.دروستکردنی ئادەم:کاتێک پەروەردگار فەرمانی بە قوڕ کرد ببێت بە مرۆڤ ئەویش بوو

٣.دروستکردنی حەوا:کاتێک خودا حەوای لە ماسولکەی ئادەم دروست کرد تا لەگەڵی بژی،ئەمە ڕێگەیەکی زۆر ژیرانەیەو بەهۆیەوە میژووی مرۆڤایەتی بەردەوام بوو

٤.زۆربوون:ئەو کاتەیە کە ئایەتەکە باسی ئەکات ئەو کاتەی کە خودا لە پشتی ئادەمەوە هەموو نەوەکانی دەرهێنا کە هێندەی مێرولەیەک ئەبوون

پرسیاری لێ کردن کا ئایا شایەتی ئەدەن تاکە خودایە و پەروەردگارە ئەوانیش شایەتییان دا

دواتر گەڕانەوە شوێنی خۆیان و تا لەکاتی خۆیان لەدایک ببن

٥.ژیانی بەهەشت:ژیانی هاوسەری لە بەهەشت ،هەموو درەختەکانی حەڵاڵ کرد بۆیان تەنها یەک درەخت نەبێ

شەیان وەسوەسەی خستە دڵیان و جوانی کرد لایان ،لێیان خوارد ئەو تاوانە بوە هۆی دابەزاندن بۆ زەوی

٦.ناکۆکیەکانی زەوی :نێوان دابەزاندی ئادەم و حەوا تاکو یەکەم فوکردنە صوردا

٧.ژیانی بەرزەخ:ژیانی ئەو ڕوحانەی کە جەستەیان مردووە،یان بەهەشتی ئەبێ یان لە عەزاب ئەبێ،لەکاتی مردنی کەسەکە تاکو ئەوکاتەی ئیسرافیل دووەم جار فوو ئەکات بە صوردا و خەڵکی هەڵئەسنەوە بۆ لێپرسینەوە

٨.نێوان هەردوو فوکردنی صور :خودا مردووەکان لە نێوان خۆیان جێ ئەهێڵێ تاکو خۆی بیەوێ

٩.لێپرسینەوە:ڕۆژی قیامەت ئەکات ،ڕۆژی دادگای خەڵکی لێپرسینەوەیان لێ ئەکرێ لەلایەن خودای ئاسمانەکان و زەوی

١٠.ژیانی هەمیشەی :یان بەهەشت یان دۆزەخ

چی وانەیەک فێر ئەبین لێرەوە؟

یەکەم:کەیسی یەکتاپەرستی مەزنترین کەیسی گەردونە،بەڵکو تاکە کەیسە،لەبەر ئەوە خودا مرۆڤەکانی دروست کردووە،و پێغەمبەرانی ناردووە و کتێبی ناردووە و تەرازوو و پێوەری داناوە،و بەهەشت و دۆزەخی داناوە

دووەم:کاتێک خودای گەورە مرۆڤەکانی بە قەبارەی مێرولەیەک دانا باسی ڕسقی نەکرد چونکە بەدەستی خۆیەتی

باسی منداڵی نەکرد چونکە بەخششی خۆیەتی

باسی مردنی نەکرد چونکە لای خۆیەتی

بەڵکو باسی یەکتاپەرستی کرد چونکە ئەوە تاکە کارە کە لەسەر ئەوان بێتت

سێیەم :خودا ڕوحی هەموو مرۆڤەکانی پێکەوە دروست کرد و لای خۆی هەڵیگرت

ئەگەر بیەوێ مرۆڤێک دروست بکات فەرمان بە فریشتە ئەکات ڕوح بکات بە بەریا و ڕسق و مردنی بۆ دیاری ئەکا

چوارەم:خودا بۆ هەر یەک جەستەیەک ڕوحێکی دروست کرد لەو جەستەیەدا ئەمێنێتەوە لەنێوان ئەرکی دوو کار یەکەم ئەو کاتەی کە لە جەستەدا دایناوە

کاتێک منداڵ لە ڕەحمی دایکیدایە دووەم کاتێک فریشتەی ڕوح کێشان دێت و لێی وەرئەگرێتەوە کاتێک کاتی مردنی دێت و کتێبەکەی دائەخرێ

پێنجەم:ڕوحەکان وەکو جەستە لەناو ناچن چونکە لە جیهانی خۆیان پارێزراون تەنانەت پێش ئەوەی بکرێتە بەر جەستەکەش

لە بەهەشتدا هەڵگیراوە یان عەزابی دوای مردن هەرچی تریش بوترێ لەسەر ڕوحەکان ئەوە نەزانییە بڕوا کردن پێیان بێ ئیمانییە ناگونجێ لەگەڵ ڕاستیەکانی قورئان و ڕاستی فەرمودەکان و بیر وباوەڕی موسڵمان

شەشەم:بێ باوەڕ بوون و مولحید بوون بوە بە مۆدێل،بەڵێ مۆدێلی مرۆڤەکان کە حەز ئەکات لە هەموو دەسەڵاتێک و چاودێرییەک هەڵگەڕێتەوە تەنانەت دەسەڵاتی ئەو پەروەردگارەی کە لە نەبوونەوە دروستی کردووە

هەموو نەفسێک ڕۆژێک لە ڕۆژان شایەتی تاک و تەنهای پەروەردگاری داوە و کاتێک دێتە سەر زەوی لەکاتی خۆی لا ئەدات و لەسەر بەڵێنی خۆی نامێنێ.

یەکتاپەرستی سروشتێکی مرۆڤەکانە

ئەم نەفسە لاوازە لە نێوان خۆی و خۆیدا دڵنیایە هێزێکی گەورە و مەزن هەیە کە کارو باری ئەم گەردونە بەڕێوە ئەبات

بەڵام ئەو نەخۆشانەی بە قەدەر و قسمەتی خودا ڕازی نین

بێباوەڕی و ئیلحاد هەڵئەبژێرن بۆ ئەوەی بەهێز دەربکەون کە هیچ کەس کۆنترۆلی ناکات و نکۆڵی لە سروشتی یەکتاپەرستی خودا ئەکەن بەڵام ئەوانە نەخۆش و گومڕان

ئەوانەی ئاسن و کانزایان ئەپەرست بۆ ئەوە ئەیانپەرست چونکە بۆ تاکێکی بەهێزتر ئەگەڕان بەڵام گومڕا بون و ڕێگەی بەهێزییان لێ هەڵە بوو

حەوتەم:لە هەموو ئەمانە وا دەرئەکەوێ کە خودا جەستەکان و ڕوحەکانی بەجیا دروست کردووە

ئەی ئەتوانین بڵێین هیچ پەیوەندیەک لە نێوان جەستە و ڕوح نییە؟

وەڵام:نەخێر

بێ گومان پەیوەندیەک لەنێوان جەستە و ڕوح هەیە بەڵام پەیوەندیەکی ئاڵۆزە

و ئەم پەیوەندییە بە گوێرەی ئاستی مرۆڤ ئەگۆڕێت

ئەوکاتەی خودا مرۆڤەکانی لە پشتی ئادەم دەرهێنا تاکو شایەتی بۆ بدەن هیچ پەیوەندیەک لە نێوان جەستە و ڕوح نەبوو

چونکە جەستە هێشتا بوونی نەبوو

بەڵام پەیوەندی نێوان جەستە و ڕوح لە ژیانی دونیا بوونی هەیە هەموومان ئەیزانین و هەستی پێ ئەکەین لە ژیانی ڕۆژانەمان

چونکە دڵخۆشی و ئازار هەردوکیان هەستی پێ ئەکەن

کاتێک لە کەشێکی هێمن و خواردنێکی خۆش هەیە و لەگەڵ ئازیزانمانین جەستەیە کە دڵخۆش ئەبێ بەڵام ڕوحیش دڵخۆشە چونکە لەگەڵ جەستەدایە

پێچەوانەکەشی ڕاستە ئەگەر مرۆڤێک بپێچینەوە و لەسەر لمی گەرمی بیابان دایبنێین ئێمە جەستەی ئازار ئەدەین بەڵام ڕوحیشی لە ئازاردایە

بەڵام پەیوەندی نێوانیان لە ژیانی بەرزەخ واتا دوای مردن هێشتا هەیە بەڵام پێچەوانەی دونیایە

چونکە خۆشی و ئازار بۆ ڕوحە جەستەش بەدوایدا

بەڵام لەو دونیا پەیوەندیەکەیان یەکسانە و وەکو یەکن.

{اتخذوا أحبارَهُم وَرُهبانهُم أزباباً مِن دون الله والمسيح ابن مريم وما أمروا ليعبدوا إِلهاً واحِداً لا إله الا هو سبحانه عما يُشرِكون}

«جولەکەکان زانایان هەبو و گاورەکان خواپەرستیان هەبوو ئەوانیان کردبوو بە پەروەردگار و دەیانپەرستن و عیسای کوڕی مەریەمیشیان ئەپەرست لەکاتێکدا تەنها فەرمانی ئەوەیان پێ کرابوو بە تاک و تەنها خودا بپەرستن هیچ پەرستراوێک نیە بە هەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە زاتی اللهُ خوای گەورە زۆر پاک و مەزنترە لەوەی ئەو کەسانە بکەن بە شەریکی»

عودەی کوڕی حاتەمی طائی لە نەسرانی بوو

پێغەمبەری بینی لەکاتێکدا خاچێک لە ملیدا بوو گوێی لێ بوو وتی:

{اتخذوا أحبارهم و رُهبانهُم أربابًا من دون الله}

«زانا و خواپەرستەکانیان لەجیاتی خودا ئەپەرستن»

ئەویش وتی:ئێمە نایانپەرستین

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)فەرموی:ئایا حەڵاڵتان بۆ حەرام ناکەن و حەرامتان بۆ حەڵاڵ کەن ئێوەش گوێڕایەڵیانن؟

وتی :بەڵی

پێغەمبەر فەرمووی :ئەوەش پەرستنە

ئایەتێکی قورئانی بازنەی شرک گەورە ئەکاتەوە لامان

باسکردنی پێغەمبەریش پێمان ئەڵێت کە گوێڕایەڵی کردنی کەسە پیاو چاکەکان و جیاکردنەوەیان وەکو پەرستنی ئیلاهی و پاڕانەوە جۆرێکی ترە لە جۆرەکانی هاوبەشدانان بۆ خودا

لێرەدا چەن وانەیەک هەیە:

یەکەم/ ئێمە پیاوەکان بە ڕاستی ئەزانین بەڵام ڕاستی و هەقی پیاوەکان نازانین

ڕێگەکە نابێتە ڕێگەی ڕاست تەنها لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی خۆشمانئەوێ بەوێدا ڕۆشتووە بەڵکو ڕاستی ڕێگا ئەوەیە لەسەر شەریعەتی خودا بێت

دووەم/

ئیسلام ڕێگە بە هاوبەشکردنی کەس نادا بۆ یاسا دانان

کاتێک دواین پێغەمبەری نارد بە شێوەیەک ناردی کە کار و باری دونیا چاک بکات تا لەکۆتایشدا هەر چاک بێت

چونکە قوئان بۆ ئەوە نێردراوە کاری پێ بکرێت نەک لەسەر مردوو بخوێنڕی یان بۆ هێنانی بەرەکەت یان بۆ خەتمکردنی لە ڕەمەزان

بەڵکو سیستمێکی مەزن و تێرە کە هەموو بابەتاکانی کۆمەڵگەی تێدا کۆبۆتەوە

سیستمی سیاسی:کار و باری سەرۆک ڕوون ئەکاتەوە و ڕێگاکانی حوکومڕانی و ڕێگاکانی وازهێنان لێی بەهەمان شێوە ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان حاکم و خەڵکەکەی

ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان ئوممەتی موسڵمانان و ئوممەتانی تر و شێوازی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەواندا چونکە ئەزانێت موسڵمانان بە تەنها لەسەر دورگەیەکی چۆڵ ناژین

سیستمی کۆمەڵی:خێزان پێک دێنێت و هەڵسوکەوت لەگەڵ دراوسێ

مافی ڕێگاو بان و مافی خەڵکی بەسەر یەکەوە

سیستمی دارای:ڕیبای حەرام کردووە،بازرگانی حەڵال کردووە،میراتی دیاریکردوە،و دەسەڵاتی گواستنەوەی پارە دانانی مافی حاکم لە بیت المال و مافی خەڵکەکەی بەهەمان شێوە

سیستمی سزا:فەرمان بە لێخۆشبوون ئەکات یەکەم جار،و پاراستنی ڕەوشت،ڕێگری لە خەڵکی ئەکات کە بکەونە حەرامەوە دوای ئەوەش دەست بڕینەوە بەردباران کردن وجەلت لێدان ئاینێک سزایەک بەسەر تاکدا ئەدات تاکو کۆمەڵگایەک ڕاست بکاتەوە

کۆمەلگەی مرۆڤایەتی لە کاتی ئادەمەوە سیستمی سزای نەبووە

سێیەم/

ئەگەر یاساش حەرامێک حەڵاڵ بکات هێشتا هەر حەرامە

ئەگەریش حەڵالێک حەرام بکات هەر حەڵاڵە

هاوبەشی ناوێ بۆ یاسا دانان،ئەوەی بەپێی یاسا مافێکی پێ بدرێ و لەڕووی شەرعەوە وانەبێ لە ڕۆژی قیامەت مامەڵەی دزێکە لەگەڵ ئەکرێ

چوارەم:

نابێت بکەویتە ئەوەو کە ئەهلی کتێب تێی کەوتن

حەرام ئەوەیە کە ئاین ئەیڵێ نەک ئەوەی شێخ

حەڵال ئەویە بەپێی دین حەڵال بێت نەک شیخ

ڕێزگرتن لە زاناکان واجبە بەڵام شوێنکەوتنیان بە گومڕایی لەکەس خۆشنابێ و هەر بە شوێنکەوتوو دائەنرێ

{واذ اعتزلتُمُهُم وما يعبدون إلا الله فأووا الى الكهف ينشر لكم رَبَكُم مِن رَحمَتهِ وَ يُهيئ لَكم مِن امرِكُم مِرفقاً}

«کاتێک کە ئێوە لە بتپەرستان و خواکانیان دورکەوتنەوە و جیابونەوە ڕۆشتن و پەناتان برد بۆ ناو ئەشکەوتەکە پەروەردگار ڕەحمەتی خۆیتان بۆ بڵاو ئەکاتەوە و کارتان ئاسان ئەکات »

ئەم ئاینە زۆر سەرسوڕهێنەرە کاتێک دڵی پیاوەکان ڕەق ئەبێت لەئاستیان خودا دڵی چیاکان نەرم ئەکات بۆیان

کاتێک دڵەکانیان وەکو بەرد و لە بەردیش ڕەقتر بوون خودا بەردەکانی وەکو دڵ نەرم و میهرەبان کرد

یارانی ئەشکەوت

کاهینەکەی لە چیرۆکی یارانی ئخدود

و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) و هاوەڵەکەی لەکاتی کۆچکردن

هانایان بۆ ئەشکەوت برد

کاتێک کە خەڵکی ئەم ئاینە بێهیوا ئەکەن بەرد و چیاکان لەباوەشی ئەگرن و ئەیپارێزن

ئاینی مرۆڤ لە هەرشوێنێک بێت ئەو شوێنە نیشتمانە بۆی

و ئەگەر نیشتمان گرنگتر بوایە لە ئاین یارانی ئەشکەوت وازیان لە ئاینەکەیان ئەهێنا و لە نیشتمانەکەیان ئەمانەوە

ئەگەر نیشتمان لە ئاین گرنگتر بوایە

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)مەککەی جێناهێشت

بەڵام لە ڕۆژی کۆچکردنی لە دورەوە سەیری مەککەی کرد و بە فرمێسکی چاوەکانیەوە وتی

سوێند بەخوا خۆشەویسترین شوێنی لام و ئەگەر خەڵکەکەم دەریان نەکردبام هەرگیز جێمناهێشتی

لەبەر ئەم ئاینە دەریان کرد

سەرکردایەتییان پێ ئەدا،پارەیان پێ ئەدا،هاوسەریان پێ ئەدا،کەچی ئەو بە مامی وت:

سوێند بەخوا مامە ئەگەر خۆر بخەنە دەستێکم و مانگ بخەنە دەستەکەی ترم تا واز لەم ئاینە بهێنم وازناهێنم تاکو خودا پێم نەڵێ یانیش بەم ئاینەوە ئەمرم

{كتب عليكم القِتالُ وهو كُرهٌ لَكُم وعسى ان تكرهوا شيئًا وهو خيرٌ لكم و عسى أن تحبوا شيئًا وهو شَّرٌ لكم والله يعلم وانتم لاتعلمون}

«شەڕکردن و جیهادکردنتان بۆ نوسراوە هەرچەنە حەزی پێ ناکەن لەوانیە ئێوە حەز بە شتێک نەکەن لەکاتێکدا خێری ئێوەی تێدایە و لەوانەیە شتێکتان خۆشبوێ  کە خرپەی تێدایە بۆتان بێگومان ئەوەی خودا ئەیزانێ ئێوە نایزانن»

هەروەک چۆن وتراوە ڕۆژووبگرن

بەهەمان شێوە وتراوە جیهاد بکەن

جیهادیش خودا پەرستیە هەروەکو نوێژ و ڕۆژوو

بەهەمان شێوەی کە نوێژ و ڕۆژوو قبوڵ ناکرێت تاکو بەو شێوەیە نەبێ کە خودا ئەیەوێ جیهادیش بەو شێوەیەیە

وەکو ئەوەی پیاوێک پێنج ڕکات نوێژی نیوەڕۆ بکات بە بیانووی ئەوەی کە خودا و پێغەمبەری خۆشئەوێ بەڵام نوێژەکەی قبوڵ نابێ چونکە خۆشویستنی خودا ئەوەیە بە گوێرەی قسەی پێغەمبەر خودا پەرستی بکرێ

یان کەسێک لە مانگی ڕەمەزان ٤٠ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت ئەوە ڕۆژووەکەی قبوڵ نابێت

خودا پەرستی بەم شێوەیەیە

جیهادکردنیش جۆرێکە لە خودا پەرستی

هەرکەس جیهاد بۆ ئەم ئاینە بکات

و بەو شێوەیە نەبێت کە ئەم ئاینە

داوای ئەکات ئەوە جیهادەکەی بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە

هەروەک چۆن خودا ڕکاتی پێنجەمی نوێژ قبول ناکات و پاداشت ناکرێ بەڵکو سزا ئەدرێ بەهەمان شێوە هەر خوێنێک بە ناهەق بە ناوەی جیهاد برژێ ئەوە کوشتنە

ئیتر نیازی کەسەکە هەرچۆن بێت

و لەبەر ئەوەی جیهاد کردن پەیوەستە بە خوێن و ماڵ و پارەی خەڵکی

خودا پەرستیەکە کە پێویستە پێش ئەنجام دانی زانیاریت هەبێ لەسەری و لێی فێربیت

چونکە جیهادکردن بە نەزانی کەسەکە ئەکات بە چەتە و ڕێگر

ئیسلام هەرگیز پێویستی بە کەس نەبووە تا پێی بڵی چی بکات و چیٔ نەکات

ڕێگا هەڵە و خراپەکان ناتگەیەنن بە نیازا باشەکانت

پێشتر پێش ئەوەی جیهادی ئەم سەردەمە هەبێت لە کەسانی نا موسڵمان ئەترساین

ئێستا موسڵمانەکان خۆیان لە موسڵمانەکان ئەترسن یان ئەو کەسانەی خۆیان بە موسڵمان ئەزانن

ئێمەش خودا و پێغەمبەرمان خۆشئەوێ

ئێمەش پێشکەوتنی ئیسلاممان ئەوێ

ستەم کردن هەر ستەم کردنە نیازی ستەمکار هەرشتێک بێت

و نامانەوێ دەستی بکوژێکی بێ ئاین بگۆڕین بۆ دەستی بکوژێکی بەڕۆژوو

ئێمە دژی بکوژین ئەگەر لەسەر هەر ئاینێک بێت

ئێمە ئەوانە بە درۆ ناخەینەوە کاتێک ئەڵێن ئێمە جیهاد ئەکەین

بەڵام ئەپرسین ئایا جیهادی ئیسلامە یان دژی؟

ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە خودا فەرمانی بو سوپاکەی کردووە کە دارێک نەبڕنەوە

و ئارامی تێک نەدەن و شەڕ لەگەڵ کەسێک نەکەن کە شەڕیان لەگەڵ ناکەن

مەحاڵە خودا هیچی تر قبوڵ بکات جگە لەوە

{قالوا ان يسرق فقد سرق أخٌ لهُ مِن قبل فأسرها يُوسف في نفسهِ ولم يُبدِها لَهُم قال أنتم شَّرُ مكانًا والله اعلم بِما تَصِفون }

«وتیان ئەگەر براکەمان دزی کردبێ ئەوا پێشتریش برایەکی هەبوو کە یوسف بوو دزی کردووە کە ئەوترێ باپیری بتێکی هەبوو ئەیپەرست ئەمیش دزیویەتی و شکاندوویەتی

کە تەنها تۆمەتێک بوە،یوسف ئەم شتەی لە نەفسی خۆی هەڵگرت و دەری نەبڕی خەفەتی خوارد و ئازاری پێ گەشت و وتی ئێوە خراپترین شوێنتان هەیە کە تۆماتتان کردووە بۆ یوسف و خودا ئاگادارە و زاناترە کە ئێوە ڕاستگۆ نین»

ژیانی یوسف بەسترایەوە بە قەمیسێک

قەمیسێک بە درۆ بەکار هات

قەمیسێک وەک بەڵگەی پاکی بەکارهات

و قەمیسێک وەکو دەرمان بەکار هات

درۆکە ئەوە بوو کە براکانی خستیانە بیرەکەوە و قەمیسەکەیان کرد بە خوێنەوە و هێنایان بۆ یەعقوب تا باوەڕی پێ بهێنن کە گورگ خواردی و لەبەر ئەوەی هیچ تاوانێک نییە بێ کەم و کوڕی بێت بیریان چوو قەمیسکە بدڕێنن

بیریان چوو کە گورگ جلەکە دانانێ لەبەری یوسف ئەوکات بیخوات

بەڵگەی پاکیەکەی ئەوەبوو کاتێک یوسف لە زولەیخا ڕایکرد ،لە دواوە ڕایکێشت و جلەکەی دڕاند و کاتێک عەزیزی میسر ویستی ڕاستیەکە بزانێ تاکو بزانێ کامیان خەتابار بوون یوسف یان زولەیخا

خودا منداڵێکی ساوای هێنایە قسە کە خزمی زولەیخا بوو وتی سەیری قەمیسی یوسف بکەن ئەگەر لە پێشەوە دڕا بێت ئەوە یوسف خەتابارە و ئەگەر لەدواوە دڕابێت ئەوە یوسف ڕای کردووە و زولەیخا لە دواوە ڕایکێشتووە و کاتێک سەیری جلەکانی یوسف کرا ڕاستگۆیی و بێتاوانی دەرکەوت

و دەرمانەکە کاتێک براکانی یوسف گەڕانەوە کەنعان بەبێ بنیامین دوای ئەوەی یوسف پلانی دانا تا لای خۆی بیهێڵێتەوە یەعقوب هێندە گریا چاوەکانی لەدەست دا یوسفیش جلەکەی خۆی بۆ نارد کاتێک کەسەر چاوی دainا چاوەکانی بۆ گەڕایەوە

ئەمە چیرۆکی سێ قەمیسە

و لێرەدا چوارەم قەمیس هەیە

قەمیسی یوسف نا بەڵکو هی ئیسحاقی باپیری کە چیرۆکێکی کۆنە

یوسف دایکی نەبوو چونکە لەکاتی لەدایک بونی بنیامینی برا بچوکی دایکی مرد

خوداش ویستی بێ دایکی بۆ قەرەبوو بکاتەوە خۆشەویستی خستە دڵی پووری کە بەرگەی دوری یوسفی ناگرت هەروەکو یەعقوب

ئەوییش قەمیسی ئیسحاقی باوکی لابوو

لەژێر جلەکانی کردیە بەری یوسف

و کاتێک یوسف گەڕایەوە لای باوکی دراوسێیەکیان هەبوو کە وتی قەمیسی ئیسحاق بزر بووە

و هەمووان دەستیان کرد بە گەڕان

و لای کەنعانییەکان ئەوترا ئەگەر دزێک بەسەر دزیەوە بگیرێ دوو ساڵ ئەبێت کۆیلەی خاوەندارەکە

و کاتێک قەمیسەکە کای یوسف دۆزرایەوە پوری وتی کە ئەبێ سوو ساڵ لای مم بمێنێتەوە لەکاتێکدا دراوسێی باوکی بوو

ئەمە هۆکاری ئەوەبوو کە براکانی ئەیانوت دزە

ئەو وانانەی لێرەوە فێرئەبین چین؟

یەکەم/

مرۆڤ لقێک لە چاوی خۆیدا نابینێ

بەڵام تەڵە پوشێک لە چاوی خەڵک ئەبینێ

چەند پیاوێک بوون کەچی پلانی کوشتنی برا بچوکەکەیان دانا

دواتر ویستیان دوریبخەنەوە لەجیاتی کوشتنی

و خستیانە بیرێکەوە و چەند کەسێک بەوێدا ڕۆشتن و دەریانهێنا و لەگەڵ خۆیان بردیان

پلانی کوشتنیان لەبیر کرد

خستنە بیرەکەیان لەبیر کرد

درۆکەیان لەبیرکرد کە لەگەڵ باوکیان کردیان

لەبیریان کرد کە چەندین ساڵ باوکیان لە ئازاردا بوو بەهۆی ئەوان

کەچی تاوانی یوسفیان هێشتا بیر بوو کە مندال بوو هەرچەنە خەتا لە یوسف نەبو

مرۆڤەکان هەمووکات بەم شێوەیەن،تاوانی خۆیان هەرچەند گەورە بێت جێی لێخۆشبوونە بەڵام تاوانی تۆ گەورەیە هەرچەند بچوک بێت

دووەم:

یوسف لە دڵی خۆی هێشتیەوە

عەرەب لە کۆندا ئەیانوت:گەورەی میللەتەکەی هەو کەسەیە کە لێرە نییە

ئەگەر بتەوێ بژیت پێویستە بزانیت هەندێک شت ئیهمال بکەیت

ئەگەر بتەوێ ڕووبەڕویی کەسانێک ببیتەوە بە هەموو ئەوەی لەسەریان ئەیزانی ئەوە هیچ کەس لات نامێنێتەوە

گوێی پێ مەدە و بڕۆ ئەمە هیچ دوروی نیە

بەڵکو ڕەوشتی پێغەمبەرانە

یوسف لە دڵی خۆی هەڵیگرت

و محمد(صلی الله علیه وسلم )ئەڵێت:با ئێمە لەگەڵ ڕوخسارەکان بگونجێین لە کاتێکدا دڵاکانمان ڕقی لێیانە،باش لەگەڵ کار و بارەکەو شوێنەکە بگونجێ و بیزانە

و هەندێک کات پێویستە ڕوو بەڕویان ببیتەوە

و هەندێک کات پێوەیستە وەکو نەزان هەڵسوکەوت بکەیت

پێویستە ژیان بەردەوام بیت و بێ ئەمانە بەردەوام نابێ

ورد بەرەوە لە دەربڕینی:بۆ ئەوەی ئەو خێزانە وەکو سوکنای و هێمنی و ئارامی و پشویەکی دەرونی بێت بۆ ئێوە

واتا هۆکاری دروستکردنی ئافرەت لە ماسولکەی پیاو ئەوەیە تاکو ببێتە ئارامی بۆ دەرونی

نەیوت بۆ ئەوەی پێکەوە بژین

چونکە هاوسەرگیری لە ماڵێکی هاوبەش زیاترە

ئەم دوو هاوسەرە زۆر زیاتر لە سەقفێکی هاوبەش و جێگەیەکی هاوبەش کۆیان ئەکاتەوە

بۆ ئەوەی ببێتە ماڵێک بۆت لە ماڵەکەتدا

چونکە پیاو وەک چۆن ئەگەڕێتەوە ماڵەکەی تا داپۆشراو بێت بە هەمان شێوە ئەگەڕێتەوە لای هاوسەرەکەی

وەک چۆن بۆ پشوودان ئەگەڕێتەوە ماڵەوە بەهەمان شێوە ئەچیتە لای هاوسەرەکەی

کاتێک خودا حەوای لە ماسولکەی ئادەم دروستکرد بۆ ئەوەی ببێت بە بەشێک لە بنچینەی ئادەم و بەم شێوەیە مامەڵە و هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات وەک ئەوەی پارچەیەک لە خۆی

و وەکو چاوی بیپارێزێ کە ژیانی بێ ئەو ناچێ بە ڕێوە

و بەم شێوەیەش ژیانی پیاو بێ ئافرەگ بەڕێوەناچێت

و لەبەرامبەردا بۆ ئەوەی ئافرەت بزابێت کە پێویستی بە پیاو هەیە وەکو ئاوارەیەک کە بیری نیشتمانەکەی ئەکات

وەکو چۆن هەتیوێک تامەزرۆی باوکیەتی

پەروەردگار بەم شێوەیە بە داناى کە بووە هۆی بەردەوامی ژیانی مرۆڤایەتی بۆ ئافرەت و بۆ پیاو

کاتێک پیاو ئەم بەشە ناسکەی خۆی خۆشئەوێت

و ئافرەت کاتێک تەواوی بوونی خۆی خۆشئەوێ و کە تامەزرۆیەتی

{قالوا حرقوهُ وانصِروا آلِهتكم إن كنتم فاعِلين}

«کاتێک بە بەڵگە دەمکوتی کردن و هیچیان بۆ نەما بیڵێن وتیان ئیبراهیم بسوتێنن و خواکانتان سەربخەن ئەگەر ئەتانەوێ تۆلە بۆ خواکانتان بکەنەوە »

ئایەتێک لەبارەی ئیبراهیم دوای ئەوەی بتەکانی شکاند کە قەومەکەی ئەیپەرستن

چیرۆکی ئیبراهیم زۆر لەوە بەناوبانگترە کە دیسان بیگێڕینەوە

بەڵام وەستاندن لەگەڵیدا

و بە وردەکاری «بیسوتێنن»

لێرەدا وتراوە(حرقوهُ) نەوتراوە(احرِقوه)

کە هەردوکی هەر باس لە سوتان ئەکات

بەڵام لەڕووی زمانەوانی عەرەبی دوو وشە نییە کە هەمان مانای پڕاوپڕیان هەبێ تەنانەت ئەوانەی هاوماناش بن

هاوماناکان نزیک بوونی مانایانە لەیەکتر بۆ ئاسانکاری و تێگەشتن

ئەی باشە واتای جیاواز نێوان(حرقوهُ ) و (احرِقوه) چییە؟

وشەی (احرق) بەواتای ئاگر کردنەوە بۆ نەبوون و نەهێشتنی شتێک

وشەی(حرق )مەبەست لێی کەم کردن و ڕسوا کردنی شتێکی سوتاو کە ئاگرەکە تەنها ڕێگەیەکە

ئەمەش ڕێک ویستی قەومی ئیبراهیم بوو کەمکردنەوەی ئیبراهیم

ئەگەر نیازی کوشتنیان هەبوایە پێویستی ناکرد ئەزیەت بکێشن و دار کۆبکەنەوە

بەڵام ئەوان دارێکی زۆریان کۆکردەوە و چەند ڕۆژێک خەریک بوون

بچوک و گەورەیان پیاو و ئافرەتیان

تەنانەت ئەوترێ کە ئافرەتێک نەخۆش بکەوتایە نەزری ئەکرد ئەگەر چاکببێتەوە ئەچێ دار کۆبکاتەوە بۆ سوتانی ئیبراهیم

و لەبەر زۆری ئاگرەکە ئیبراهیمیان بە تۆپ هاویژ هەڵدایە ئاگرەکەوە چونکە نەیانئەتوانی هەڵیگرن و بیخەنە ئاگرەکە

ئەمە مانای سوتانی ئیبراهیم بوو بۆ کەمکردنەوە و لەکەدار کردنی ئیبراهیم

لە ئایەتێکی تری قورئان باسکراوە

کە لەمەوە هیچ گومانێک نامێنێ بۆمان کە سوتاندن بە واتای کەمکردنەوە لە نرخی شتێک دێت نەک تەنها سوتاندن و نەهێشتنی

دوای ئەوەی موسا لە بینینی خوای گەورە گەڕایەوە بینی کە بەنی ئیسرائیل دەستیان کردووە بە پەرستنی بتێک کە لە ملوانکەو خشڵی ئافرەتانی بەنی ئیسرائێل دروستکرابوو کە سامری دروستی کردبوو

و پێی وت:

{وانظر إلهك الذي ظلت عَلَيهِ عاكِفاً لنُحرَّقنهُ ثم لننسِفنهُ في اليم نسفًا}

«سەیری خوایەکەت بکە کە بەردەوام مایتەوە لەسەری و عیبادەتیت کرد ئە یَ بیسوتێنین بە ئاگر پاشانیش خۆڵەمێشەکەی ناو دەریا تا بڵاو بێتەوە »

لێرەش لە مانای سوتاندا هەمان وشە بەکارهات

موسا ئەیتوانی ئەم بتە بشکێنێت هەروەکو محمد(صلی الله علیە وسلم)بتەکانی قوڕەیشی شکاند کاتێک گەڕایەوە مەککە بەڵام موسا سوتاندنی هەڵبژارد بۆ ڕسواکردنی ئەم پەرستراوە

چونکە موسا پێی وتبوون کە مەزنی خوای گەورە چەنێکە و ویستی بە سوتاندنی ئەم پەرستراوە ڕسوای دەربخات کە ئەم خەڵکە بە مەزنیان ئەزانی

له تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئەگەر لە دوای خۆت خێرێکی نەبڕاوە جێناهێڵیت

ئەوە لانی کەم خراپەیەکی نەبڕاوە دوای خۆت جێ مەهێڵە

کە دوای مردنیشت ئەو هەر بمێنێ

{قال فما خطبُك يا سامري قال بصرتُ بِما لم يبصِروا بهِ فقبضت قبضة من أثر الرسول فنبذتُها وكذلك سولت لي نفسي قال فاذهب فإن لك في الحياة أن تقول لا مِساس وإنَّ لَكُ موعِداً لن تُخلفهُ وانظر إلى إلهك الذي ظلت عَلَيهِ عاكِفا لنُحرَّقنهُ ثم لَننسِفنهُ في اليمِ نسفًا}

«موسا سەیری سامری کرد و وتی:ئەی سامری چی وای لێ کردیت ئەم کارە بکەیت ،گوێلکێک دروست بکەی لە ئاڵتون و بانگی خەڵکی بکەی بۆ پەرستنی

سامری وتی:ئەوەی من بینیومە ئەوان نەیانبینیوە کە جبریلی بینیوە لەسەر ئەسپەکەی و مشتێک لە شوێنەواری ئەسپەکەی جبریلم هەڵگرتووە و فڕێم دایە سەر ئەو ئاڵتونە تواوەیە لەسەر شێوەی گوێلک کە بیوتایە ببە هەر شتێک دەبووە ئەو شتە

موسا وتی دەبڕۆ ئێرە جێبهێڵەو دورکەوە چونکە دەستت بۆ شتێک برد کە بۆت نەبوو دەستی بۆ ببەی تا لە ژیان ماوی ئەبێ کەس لێت نزیک نەبێتەوە و تێکەڵی کەس نەبیت

و دڵنیابە تۆ دیدارێکت هەیە لەگەڵ خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت سزای خۆت وەرئەگریت سەیری خوایەکەت بکە کە مایتەوە لەسەری و ئەتپەرست ئەبێ بیسوتێنین بە ئاگر پاشانیش خۆڵەمێشەکەی بخەینە دەریاوە»

ئەم ئایەتە یەکێکە لەسەرنج ڕاکێشترین ئایەتەکانی قورئان لە ڕووی باسکردن و لەڕووی ماناوە ،قورئانیش هەمووی جێی سەرنجە

ئەی چۆن وانابێت؟

وەک پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) وتی کاتێک گوێی لە وقسەکانی زبرەقانی کوڕی عودەی بوو بەرگری لەخۆی ئەکرد

« لە ڕونکردنەوەدا جادوو هەی»

ئەگەر ئەمە ڕونکردنەوەی خەڵکی بێت

ئەی ئەبێ ڕونکردنەوەی پەروەردگاری خەڵکی چۆن بێت

و ئەم سامرییە زۆر قسەی لەسەر هەیە

و ڕونکردنیەوەە فراوان و زۆری لەسەرە

دوای خوێندنەوەیەکی زۆر لەسەری ئەمە ئەنجامی بوو:

سامری موسای کوڕی زەفەر ،لە بەنو ئیسرائیل پێی ئەوترێ سامەرە و ناوی بزر بوو لە کۆمەڵەکەیدا ،هەموو چاخێک هەر وابووە چونکە ئەبو بەکر بەناوبانگتر بووە لە عبداللهی کوڕی ئەبی قەحافە

وموتەبەنی بەناوبانگتر بوو لە عەلی کوڕی حوسەین

بەهەمان شێوە ئەعشا و شەنفەری،

بە نزیکەی لە تەمەنی موسادا ئەبوو چونکە کەو ساڵانە لەدایک بووە کە فیرعەون منداڵی کوڕی دەکوشت و کچەکانی ئەهێشتەوە

دوای ئەوەی خەون زانەکان پێیان وت کە کوڕێک لە بەنی ئیسرائیک ئەبێت هۆی لەناوبردنی

و ئافرەتەکان کاتێک ئەگەشتە کاتی مندال بونیان ئەچونە شاخ و دەشتەکان تا لەوێ منداڵیان ببێت

ئەگەر کچ بوایە بێ ترس ئەگەڕانەوە چونکە کچان مەترسیان لەسەر نەبوو

ئەگەریش کوڕ بوایە لەوێ دایان ئەنا لە ترسی کوشتنی و خودا فریشتەی ڕائەسپارد تاکو خواردن بەو منداڵانە بدەن

جبریل خۆی ئاگاداری سامری بووە

ئەمەش هۆکار بوو کە سامری شوێن پێی ئەسپەکەی جبریلی بینیوە

بەڵام بۆچی دایکی موسا وەکو ئافرەتانی تر لە شاخەکان موسای نەبوو؟

چونکە خودا ویستی ئەم کوڕە لە ڕیزی پێشەوەی سوپا بێت نەک لە ڕیزەکانی دواوە

و ئەگەر خودا ویستی لە شتێک بێت هەموو هۆکارەکانی بۆ ئەگونجێنێ

ڕۆژ هات و چوو موسا لە ماڵی فیرعەون گەورە بوو و سامریش دوور لە موسا

کاتێک بەنی ئیسرائیل کە میسر دەرچوون سامری لە قەومی موسا بوو

کاتێک فیرعەون لە کەنار دەریاکە پێیان گەشت موسا بە گۆچانەکەی دەریای شەق کرد و بەنی ئیسرائیل تێپەرین فیرعەونیش بەدوایاندا

جبریل لە نێوان قەومی موسا و فیرعەون بوو

خۆڵەکە جوڵایەوە بەهۆی ئەسپەکەی جبریل وەک بڵیی ڕوحی لەبەر بێت ئەمەش یەکێک بوو لە بەرەکەتی جبریل کە خودا لە زۆر شوێن باسی کردووە و بە ڕوح ناوی ئەبات

سامریش زانی ئەمە ئەو جبریلەیە کە بەمنداڵی هاتۆتە لای

بەڵام بەنی ئیسرائیل ئاوڕیان نەدایەوە چونکە ئەمەیان نازانی بە بەڵگەی ئەم ئایەتە:

{بصرتُ بِما لم يُبصِروا بهِ}

« ئەوەی من بینیم ئەوان نەیانبینی»

گرنگ لێرەدا سامری ئەو خۆڵەی لەگەڵ خۆی برد کە ڕوحی تێدابوو

و کاتێک تێپەڕین خودا فەرمانی بە دەریا کرد فیرعەون نوقم بکات

دوای ئەوە موسا چوو قسە لەگەڵ خودا بکات و هارونی برای لای قەومەکەی جێهێشت

سامریش ملوانکە و ئاڵتونی ئافرەتەکانی کۆکردەوە

ئەو ئاڵتونانە بوون کە لە ژنەکانی میسر وەریان ئەگرت بە کرێ

لێی وەرگرتن و وتی ئەمە بۆ ئێوە حەڵاڵ نییە

هەمووی کۆکردەوە و تواندێوە و گۆلکێکی لێ دروست کرد ئەو خۆڵەشی کرد بە سەریا کە هەلیگرتبۆوە

گۆلکەکە دەنگی دەرئەکرد وەک ئەوەی ڕوحی تێدابێت ،سامری فەرمانی کرد کە ببپەرستن و زۆربەی خەڵکەکەش وایان کرد

تەنها هارون و بڕێکی کەمی خەڵکی نەبێ

کاتێک موسا گەڕایەوە گۆلکەکەی سوتاند سامریشی کە بەنی ئیسرائیل دەرکرد و فەرمانی بە خەڵکی کرد لێی نزیک نەبنەوە بە فەرمانی خودا

{فإن لك في الحياة ان تقول لا مِساس}

دەستت بۆ شتێک برد کە نابوو دەستی بۆ ببەیت تا لە ژیاندای ئەبێ کەس لێت نزیک نەبێتەوە و تێکەڵی کەس نەبیت »

وانەکانی ئەم ئایەتە

یەکەم/

ئەو موسایەی فیرعەون گەورەی کرد بوو بە پێغەمبەر

و ئەو موسایەی جبریل گەورەی کرد بتی پەرست

گرنگ نییە چۆن دەستپێئەکەیت بەڵکو ئەوە گرنگە کۆتایەکەت چۆن ئەبێ

دووەم/

قەدەر و قسمەتی خودا هەر ئەبێ ڕوبدات

هۆکارێک دوای ناخات،هیچ شتێک و هێچ ڕێگەیەک ڕێگری لێ ناکات

فیرعەون هەزاران منداڵی کوشت پێی وابوو یەکێک لەوان ئەو منداڵەیە کە ئەبێتە هۆی لەناوچوونی و کاتێک ئەو منداله لەدایک بوو لە کۆشکەیەی خۆیدا گەورەی کرد

سێیەم/

دڵەکان سەربازێکن لە سەربازەکانی خودا

ئارامی ئەکاتەوە تاکو قەدەرەکەی خۆی جێبەجێ ببێت

و ناسکی ئەکات تاکو ئەوەی خۆی ئەیەوێ ببێت

دڵی دایکی موسای ئارام و لەسەخۆ کرد تاکو بیخاتە ئاوەکەوە

دڵی ئاسیاشی نەرم کرد تا بیپارێزێ و گەورەی بکات

لە دایکێکی وەرگرت و بەخشی بە دایکێکی تر

چوارەم/

هیچ سەیر نییە کە لەئەنجامی گەورە کردنی جبریل بۆ سامری بێ باوەڕ دەرچوو

لە ماڵێکی موسڵمان کەسێکی بێ دین دەرئەچێت وەکو کوڕەکەی نوح

لە ماڵێکی بێ دین موسڵمانێک دەرئەچێت وەکو ئیبراهیمی کوڕی ئازر

لەوانیە هاوسەرەکە ئیماندار بێت و خێزانی کافر بێت وەکو خێزانی نوح و لوط

و خودا لەبەهەشتدا ماڵێکی بۆ ئاسیا دروست کرد لەکاتێکدا هاوسەرەکەی ئەیوت من خوای ئێوەم

بەندە هەرچی پێشکەشی بەندە بکات وەکو ئەوە نییە کە خودا پێشکەشت بەندەی ئەکات کەچی ئەو بەندەیە لەجیاتی سوپاسگوزاری کفر ئەکات

هاوبەشی بۆ دا ئەنێت باوەڕ بە یەکتاپەرستی ناهێنێ

ئەوترێ خودا ئەفەرموێ:من و جنەکان و فریشتەکان لە شوێنێکە بەرزداین من دروستیان ئەکەم و غەیری من ئەپەرستن من ڕسقیان ئەدەم و سوپاسی غەیری من ئەکەن

بەیهەقی وتوویەتی لە ئەبی دەرداء گێڕاویەتیەوە

پێنجەم /

مرۆڤەکان زوو کەبیر ئەکەن

خودا لە فیرعەون ڕزگاری کردن

دەریای بۆ شەق کردن

دوژمنەکەیانی نوقم کرد

ئەوانیش کاتێک گەشتنە وشکانی

گۆلکێکیان پەرست کە خۆیان دروستیانکرد

ئەگەر ئەمە وەفای خەڵکی بێت بۆ خودا ،ئەی ئەبێ بۆ خەڵکی تر چۆن بن؟

کەسی تێگەشتوو چاوەڕێی گێڕاننەوەی چاکەکەی ناکات چونکە ئەزانێت هیچ شتێک لەی خودا ون نابێت

بەڵام ئەگەر چاکەیەکت بەرامبەر کرا و نەتتوانی بیدەیتەوە ئەوەنە بەسە کە لەبیری نەکەیت

ئەگەر خودا تورە ببێت بەرامبەر بە کەم زانینی نیعمەت و پێ نەزانین بە چاکە و ئەو دەوڵەمەندترینە ئەوا بێگومان خەڵیش تورە ئەبن و لایان ناخۆشە چونکە هەژارن بەرامبەر یەکتر

{نحن نَقُصُ عَليك أحسن القِصص بِما أوحينا إليك هذا القرآن وإن كنت مِن قبلهِ لَمِن الغافِلين}

«خوای گەورە قورئانی بۆ سەر پێغەمبەری خودا دابەزاند ئەویش سەردەمێک بەسەرمان خوێندیەوە هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەر پێمان خۆشە چیرۆکمان بۆ بگێریتەوە ،ئێمە باشترین چیرۆکی ئوممەتتان بۆ ئەگێرینەوە  هەرچەن تۆ پێش دابەزینی وەحی بێئاگا بوویت لە رودا و بەسەرهاتی پێغەمبەرانی پێشوو»

چیرۆکە قورئانییەکان باسکردنی چیرۆکەکان پێش ئەوەی کەسایەتیەکان باسبکرێت و شوێنی خۆیان بگرن

یان باسکردنی کەسایەتییە سەرەکی و لاوەکیەکان

یان جیاوازی گێرانەوەکان و جیاوازی کاتەکان

چیرۆکی یوسف وەکو چیرۆکە قورئانیەکانی تر دابەش ئەبێتە سەر کەسایەتییە سەرەکی و لاوەکییەکان

و ئێمە وا راهاتووین کاتێک گەشتین بە کەسایەتییە قورئانییەکان وا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەین کە کەسانێکن وەکو ئیمە لە گۆشت و خوێن نازانین کە ئەم کەسانە بەلگەی زۆریان بۆ  هەڵگرتووین

هەندێک بەڵگە کە زۆر گەورەتر و فراوانتر و قوڵترن لە تەنها مرۆڤبوونیان

قوئان کاتیک باسی یوسف ئەکات ئەیەوێ ئێمە کەو نیشانانە تێبگەین کە یوسف ئەینوێنێت

من بەم شێوەیەی ئەبینم کە هەموو کەسایەتییە قورئانییەکان ڕەمز و نیشانەن کە ئەبێ ئێمە لێی تێبگەین

کاتێک زۆر باس لە کەسایەتییەک ئەکرێ مەرج نییە مەبەست لێی کەسەکە بێت بە خوێن و گۆشت بەڵکو ئەو هۆکارانەن کە ئەم کەسایەتییە ئەینوێنێ

لێرەدا یوسف نیشانەیەکە بۆ جوانی و زوڵەیخا نیشانەیە بۆ حەز و ئارەزوو

قوئان ئەیەوێ باسی ئەمە بکات جوانی و شەهوەت

ئەمەش هۆکارە کە خودا لە قوئاندا باس لە ٢٥ پێغەمبەر ئەکات لەکاتێکدا زیاد لە هەزار پێغەمبەر هەبوون ئەوانەی کە لە قورئان باس نەکراون و ناویان نەهێنراوە لەوەیس باس لە هۆکارێک و لە هەڵسوکەوتێک کرابێت تیایاندا

وەکو یوسف/جوانی

زوڵەیخا/ئارەزوو

یەعقوب /باوکایەتی

براکانی یوسف/حەسودی

ئاخناتوون/دەسەڵات و پاشایی

ئافرەتەکان/هاوڕێی خراپ

عەزیزی میسر لە ڕۆڵی هاوسەردا/دەوڵەمەندی

منداڵەکە/شایەتی هەق

دوو هاوڕێکەی زیندان/هەموو خەڵکی

هەر بۆیە ئیبراهیم موسا بوو نەمرودیش فیرعەون بوو

لافاو و بۆق و مشک و خوێن و قۆچانەک و فیل و ئەبابیل و گوێ دێژ هەموویان سەربازی خودان

قارون و هاوسەرگیری پارە و دەسەڵات

لەوانەیە کەسایەتییەکان بگۆڕێن و جیاواز بن بەڵام هێشتا هەمان مانا ئەبەخشن

ئە مێرولەیەی کە ترسا سولەیمان و سوپاکەی ئازاریان بدەن
هەمان ئەو چیرۆکەی سورەتی (یس) کە لە شارەکەوە هات

ولما سكت عن موسى الغضب أخذ الألواح}

«کاتێک موسا توڕەییەکی هێمن و ئارام بۆوە لەوحەکانی تەوراتی هەڵگرتەوە»

وانەی یەکەم/

پێشبینی ئەوە لە خەڵکی مەکە کە ببن بە فریشتە

پێغەمبەرێک لە ئولو العزم توڕەئەبێت و لەوحەکان فڕێ ئەدات

چونکە لە کۆتایدا ئەویش هەر مرۆڤە

دووەم/

پیاو چاکان پەلە ئەکەن لە چاکردنەوەی ئەوەی تێکیان دا

ئەوەتا موسا ئەو هەڵئەگرێتەوە کە فڕێی دا

و ئەگەر هەڵەت کرد

داوای لێبوردن بکە

ئەگەر شتێکت تێک دا

چاکی بکەوە